

# بەئیرادەوە هەنگاوبنێ بەرەو لوتکەی بەختەوەری



نوسینی :

ڕێناس عدنان

ئەو دڵەی ئێستا لە سینە دایە

هەتا لێی بدا کێشە سانایە

وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ
شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ

ناوی کتێب: بەئیرادەوە هەنگاو بنێ بەرەو لوتکەی بەختەوەری

نوسینی: ڕێناس عدنان.

تایپ و دیزاینی بەرگ: نووسەر.

نرخ: ( ١٥٠٠ ) دینار

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات / هەولێر

تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە.

لەبەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردەی ( 862 )ساڵی ( 2015 )پێدراوە.

# بەئیرادەوە هەنگاو بنێ بەرەو

# لوتکەی بەختەوەری

نوسینی:
رێناس عدنان

هیوای سەرەکیم تەنها سودبینینی تۆی خوێنەرە

# پێشەکی نوسەر

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ،سەلام و ڕەحمەت و بەزەیی خودای پەروەردگار لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر و پێشەوای ئازیز و خۆشەویستمان(محمد)ﷺ ،سوپاس و ستایش بۆ خودایەك کە ئاگادارە بەنهێنی ئاسمانەکان و زەوی ،وەئاگادارە بە هەموو ئەو کردەوانەی کە بەندەکانی ئەنجامی دەدەن،وە سۆز و بەزەییەکەی هێندە زۆرە کە مرۆڤەکان توانایان نیە ئەگەر چی بەڕادەیەکی کەمیش بێت پەی بەو میهرەبانی و لێبووردەییە ببەن ،وە ژیانی دونیاشی بەدی هێناوە تاوەکو قوتابخانەیەك مۆڵەتمان بدا فێربین و پاشان تاقی مان بکاتەوە کە ئاخۆ کام لەبەندەکانی بەنمرەیەکی باش دەر دەچن و سەرفرازی هەردوو دونیا بە دەست دەهێنن.

هەر بۆیە ئێمەش بەیارمەتی پەروەردگار پەردە لەسەر مەبەستەکەمان هەڵ ئەدەینەوەو دەڵێین:خوێنەری ئازیز ئەم ئەم کتێبەی کە ئێستا لە بەردەستت دایە ،باس لە بابەتێك دەکات کە ئەم بابەتە بووە تەخاڵێك لەسەر پەڕی ژیانی هەموو کەسێکی ئەم ڕۆژگارە ، هەر بۆیە بەپێویستامان زانی بەئەندازەیەکی زۆر یان کەم بیخەینە بەرچاوی تۆی خوێنەر و ئەو کەسانەی کە بەڕواڵەت نیانە کەچی لەناوەڕۆکیشدا بەدەستیەوە ئاوارەی بوون ،ئەم بابەتەش گیرۆدە بوونە بەهەستی ڕەش بینی و لوتکەی بێتاقەتی و بێ هیوابوون لە گەیشتن بە بەختەوەری،ئینجا لەژێر ڕۆشنایی ئایەتە پیرۆزەکانی پەروەردگار و فەرموودە نازدارەکانی پێغەمبەرمان ﷺ وتەی پیاوصالحەکانی ڕۆژگار،باسێکی پوختی لەبارەوە دەکەین و هۆکارەکانی دروست بوونی ئەو هەستە تاڕاددەیەك ڕۆشن دەکەینەوەو بەپێی تێگەیشتنی خۆمان چەندچارەسەرێکی مەنتقی دەپاڵێوین ودەیکەینە ئامانج بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکەمان وە بەراوردی پێ دەکەین لەگەڵ ئاستی خەڵکی ئەم سەردەمە ،

تابتوانین سودێك بەتۆی خوێنەر و ئەوانەی بەوشێوەیە گیرۆدەی بوون بگەیەنین،چونکە بەڕاستی لەم سەردەمە جەنجاڵەی ئێستامان دا بەدەگمەن ئەگەر نا هەموو لە خەمباری و دڵ نائارامی دا ڕۆژ ئاوا دەکات و مانگ بەسپێدە دەگەیەنێت ،وە ئەم دیاردەیەش وەکو پەڵەهەورێکی ڕەش کە بەردەوام بەسەر خەڵکیەوە دەسورێتەوە و پێش خۆری بەختەوەری لێ گرتوون ، بەتایبەتی بەسەر گەنجەوەیە و بەشێوەیەکی زۆر دیار ڕوخساری زۆر رینەیانی بەرەو لۆچ بوون و ڕەش هەڵ هەڵگەڕان بردووە ،هەر لەبەر ئەوە هەنگاو هەڵئەگرین تا لەدەرگای کێشەکان ئەچینەژوورەوە و بەیارمەتی خودای پەروەردگار لەدەرگای چارەسەرەکان بێینە دەرەوە و بتوانین هاوکاری ئەو کەسانە بکەین کە عەودالی چارەسەرن.

مرۆڤ لەهەموو کاتێکدا بۆچارەسەری هەرکێشەیەکی پێویستە بگەڕێتەوە بۆ خزمەت قورئانی پیرۆز،تاوەکو چارەسەری کێشەکانی دەست بکەوێت،هەروەکو خودای پەروەردگار دەفەرمووێ(**وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ** ﴿٨٩﴾)واتە: ئەو قورئانەمان بۆ ناردیت ئەی پێغەمبەرﷺ تا هەموو شتێك روون بکاتەوە ،واتە-دەتوانن بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە چارەسەری هەموو کێشەکانمان بکەین و بەهۆیەوە ڕێگەی خۆمان بدۆزینەوە .

وە پێویستە چەند ڕونکردنەوەیەك بدەین سەبارەت بەشێوازی نوسینی نێو ئەم کتێبە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە بابەتەکانی ناوی ،ئەم کتێبە لە چوار بەش پێك هاتووە کە ئەمانە لە خۆدەگرێت ،بەشی یەکەم:باسێکی گشتیە لەسەر خەم و نائارامی دەرون و وەسفێکی گشتی لەسەر بەختەوەری ، بەشی دووهەم: ئەو هۆکارە دیارانەی کە ئامادە کاری دەکەن بۆ دروست بوونی خەم و خەفەت لەدڵدا و بێزاریەك کە هەندێك جار تاك بێ ئەوەی

هەستی پیٚ بکات توشی دەبێت ،وە بەشی سێهەم :کۆمەڵە چارەسەرێك بۆ ئەو هۆکارانەی کەلەبەشی دووهەم دا ئامەژەمان بۆی کردووە ،و چەند خاڵێکی تری زیاتر بۆئەوەی ئەو کەسەی کە کێشەکەی هەیە لە ڕێگایەك زیاتر بەکاربهێنێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ،وەهەروەها بەشی چوارەم : کۆمەڵێك لەبەسەر هاتوو نمونەی ژیانمان هێناوەتەوە ، بۆئەوەی خوێنەر سودیان لیٚ ببینێت لەڕووی پەند وەرگرتن و ئامۆژگاری و ببێتە ئەزمونێکی باش لەژیانی دا ،وە پێویستە تۆی خوێنەر ئەوە بزانیت ئەو بەسەر هاتانە هەندێکیان سەرچاوەکەیان نوسراوە بەڵام هەندێکی تر نەنوسراون ئەوانەی کە نەنوسراون هۆکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆمان بوینەتە سەرچاوەی ئەو چیرۆکە،چونکە سەرچاوەکەی یان بەتەجروبەی ژیان بەسەرمان هاتووە، یاخود لە خەڵکانی دونیا دیدەمان وەرگرتووە کە خۆیان لەناو واقیعی ڕوداوەکەدابوون کە ئەو ڕووداوانەش سەردەمیانەن و زیاتر بە ئێوە ئاشنان.تاوەکو خوێنەر هەستبکا کە زۆر خەڵکی تر پێش ئەو هەبوون و هەمان کێشەیان هەبووەو چارەسەریان کردووە .

وە لە خودا گەورە داواکارم ئەم بەرهەمە بچوکەم بۆبکاتە تێشووی دوا ڕۆژ و بەردەوامیم پێببەخشێت تاوەکو بتوانم سود بەخۆم و کۆمەڵگاکەم بگەیەنم ئەگەرچی بەڕادەیەکی کەمیش بێت ،وە سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کەیارمەتیان دام لەگەیاندنی ئەم کتێبە بەچاپ خودای گەورە دەست بەتەمەنیانەوە بگرێت و نمونەیان هەر زۆر بکات ،وە ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بە هەموو ئەو هاوڕێیە خۆشەویستانەی کەهانیان داوام تاوەکو بەردەوامبم لە نوسینەکانم .

وە دەستخۆشیەکی بێ پایانی مامۆستای بەڕێز مامۆستا (باپیر شێروانی) دەکەم ، پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی حاجی جەواد،کە زۆر یارمەتی دام لە تێگەیشتنی فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ،وە سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ هاوڕێی شیرینم کاك(فەرهاد لەتیف) کە پێش بینی بۆ کردم کتێبێکی لەو شێوەیە بنوسم و سودی پێ گەیاندم لە هەندێك سەرچاوەوە ،وە ڕێز و خۆشەویستم هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕەخنەی بنیات نەریان ئاراستەم کرد، بۆیە دەبێ ئەوەش بزانین کە هیچ کەسێك فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵە نیە ،گرینگە ئەوەیە هەوڵ بدەین و تێ بکۆشین بۆ کۆمەڵگاکەمان ، وەخودای گەورە هەموومان لە بەهەشتەکەی خۆی دا کۆبکاتەوە....

اللهم امين ........................

١٩/ ٨/ ٢٠١٥ زاینی
١٩/گەلاوێژ/ ٢٧١٥کوردی
١٤٣٦/١١/٤ کۆچی

# بەشی یەکەم

## باسێکی کورت بۆ سەرەتایەك لەسەر بابەتەکەمان:

بۆنزیك بوونەوە لە کرۆکی بابەتەکەمان سەرەتا با پێناسەیەکی خەم بکەین لەڕووی چەمکەوە :خەم :-ئەو حاڵەتە خۆنەویستە لەناکاوەیە کە بەسەر مرۆڤ دادێت و لەبارێکی ئاسودەیی کەش ئاساوە دەیگۆڕێت بۆ بارێکی نائاسودە و ون کردنی ئەو مرۆڤەیە لە ژووری دەرونی دا کەوای لیَ دەکات ڕۆبچێت لەناو بیَ چارەیی و بیَ ئومێدی دا ،کە تێیدا مرۆڤ زۆر نائارام و دڵ توند ئەبێت ،وە هەر مرۆڤ زۆر تا کەم ئەم پێناسەیە وەکو حاڵەتێکی بەردەوامی سەردەمیانە لەخۆیدا بەرجەستە دەکات، وە چەندین جاریش هەندێك لە بەربەست هەڵ دێن و دونیای ئەو کەسە تاریك دەکەن کەوای لیَ دەکەن بەرادەیەکی بەرچاو لە هەوڵ و ئامانج و ئەو دڵخۆشیەی کە لە ناخیاندا هەیە ساردبێتەوەو نەتوانێت چێژ لەو تەمەنە کورتەی ببینێن،هەربۆیە کورد گوتەنی تازوو نەخۆشی چارەسەر بکرێت باشترە ،تا گیرۆدەی نەخۆشی لەوە گەورە تر نەبووین،لەلای زۆری خەڵك وا باوە کە هەرکەسێك نەخۆش کەوت ئەبێت بەشێوەیەکی خێرا بچێتە لای دکتۆر تا پشکنینی بۆ بکات و بەزووترین کات لە هۆکاری نەخۆش کەوتنەکەی ئاگەدار بێتەوە ، نەوەکو نەخۆشیەکی کوشندە بێت ، کەچی لە هەمان کاتدا کە توشی نەخۆشیەکی دەرونی دەبێت بەتایبەتی ئەو نەخۆشیانەی کە پەیوەندیان بە خەم و خەفەتەوە هەیە ،ئەو هەر زوو فەرامۆشی دەکات و خۆی لیَ بیَ خەبەر دەکات ،بەڵام بیَ ئاگاشە لەوەی کە ئەو نەخۆشیە زۆر ترسناکترە لەو نەخۆشیانەی کە بە جەستە توشی ئەبێت ،لەبەر ئەوەی نەخۆشیە جەستەییەکان کاتێکی دیاری کراو دەخایەنێت کەچی نەخۆشیە هزری و فکری و دەروونیەکان تەمەنێك پێوەی دەناڵێنێت و یەك هەنگاویش

هەڵناگرێت بۆ بن بڕکردنیان، بۆیە ئاگەدار بوون لێیان زۆر گرینگترە لە هەوڵدان بۆ چارەسەر کردنیان ، چونکە ئاگەداربوون خۆی لە خۆی دا واتا چارەسەر هەروەکو لە نەریتی کۆمەڵگاکەماندا هاتووە کەوتراوە خۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکرد.

## بیرکردنەوەی مرۆڤ لە خودی خۆی بۆ دۆزینەوەی کێشەکانی :

مرۆڤ کاتێك کە دەگاتە لوتکەی خەم و بێتاقەتی بەبێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات بیرۆکەی نائاسایی لەخەیاڵی دا دروست دەبیت ،جا بەڕاستی ئەلێرە دا شارەزایی ئەو کەسە بەدیار دەکەوێت کە چۆن خۆی لە داوی ئەو هەستە نەرێنیانە ڕزگار بکات و لە گێژاوی بێ هەڵوێستی دا مەلە نەکات .هەروەکو لەوێنەی ئەو یەزیدی بوستامی کە دەفەرموووێ (هەموو هۆکارەکانی دونیام کۆکردەوە و بەستامەوە بەگوریسی قەناعەتەوە و خستمە مەنجەنیقی ڕاستیەوە و فڕێم دایە دەریای بێزاریەوە ئیتر حەسامەوە)،بۆیە پێویستە مرۆڤ وەکو کەسێکی لێزان و کارامە لە کێشەکانی بڕوانێت و پەنجەی ئیرادە لەسەریان دابنێت و دەستنیشانیان بکات بەشێوەیەکی ڕوون تابەزووترین کات چارەسەرەکانی خۆی بدۆزێتەوە و ئاسودەیی بەدەست بهێنێت .مرۆڤ چەندین بەڵگەی عەقلی هەیە کە دەتوانێت بیان کات بە یەکێك لە ئەستێرە گەشاوەکانی ئاسمانی دەرونی تا بەهۆی تیشکەکەیەوە قەناعەتی لا دروست بێت ،و کەشێك بۆ خۆی بخولقێنێت کەبەرەو ئارامی دەروونی دەبەن .کێشەکانی مرۆڤ لەم ڕۆژگارە دا گەلێك زۆر بوون بەشێوەیەکی لێ هاتووە کە ئەو کێشانە وەکو دەریایە کی لێ هاتووە و کە بەشەپۆلەکەی هەر ڕۆژەو تاکێك هەڵ نەداتە کەنارێکی خەم باری ،وە ئەم کێشانە وا لەمرۆڤ دەکەن میزانەی خۆی لەدەست بدات،هۆیەکەشی زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەمیشە بەشێوەیەك لەو کێشانەی دەڕوانێت کە دووربینی ترس لەم هەڵ وێستەی دا بەکار

دەهێنێت و هەر لە دوورەوە کە کێشەکانی خۆی بینی ئەوا وەکو دەریایەکی گەورە دێتە پێش چاوی کە لای وایە ناتوانێت مەلەی تێدا بکات و خۆی ڕزگار بکات کەچی لە بنەڕەتیش دا هەر سەرابەو هیچ بوونێکی نیە ،جگە لەچەند بەربەستێکی لاوازی مەعنەوی ،لەگەڵ ئەوەش دا بایەخدان بەو سەرابە کە نەکا ببێتە شتێکی واقیع ،لە بەرئەوە دەبێت بە چاوێکی سادەو سانا لە کێشەکانی بڕوانێت ئەوەك پەڵە هەوری ترس و گومان پێش چاوی ئاسودەیی بگرن و نەیەڵن چارەسەرەکان لە ئاسمانی فیکر و هۆشیدا ببینێت .بۆیە پێوستە بە دەستێکی پۆڵاین و عەقڵێکی جوامێرانە بەو کارە هەڵسێت و ئەوەی بەربەستە بەیەك فوی ئومێد و ئیرادە بەبای دابدات تا لە پێش خۆی لا بدات.

## بەختەوەری لێتەوە نزیکە ئەتوانی هەست بە تە پەتە پی بکەی لەناخت دا :

بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو لەم کاتانەی ئەم سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر شەکەتوو ماندون ، بەدوای ئاسوویییەوە وێڵن، هەر جۆرە و بەشێوەیەك عەودالّی ئەو هەستە بووە ،بەشێك ئاسودەیی لە کۆکردنەوە سامان دا ئەبینێت بەشێکی تر لە پلەو پایەدا هەندێکی تر لە پێکهێنانی خێزاندا هەندێکی تر لە پۆشتەیی جل و بەرگ و شتی دونیایی ،ئیتر هەرکەسەو بەجۆرێك لەپەنجەرەکەی خۆیەوە ئەڕوانێتە ژیان ،

بەڵام کۆکراوەی هەموو ئەو حەزوبەدواگەڕانە بۆیەك خاڵ ئەگەرێتەوە ئەویش سەیرنەکردنی بەر پێی خودی خۆیەتی ،لەبەر ئەوەی بەشێوەیەك ئەم شتە دونیاییانە بەنج و بێئاگایان کردووە کەوا هەست بکا بۆ دەست کەوتنی چارەسەر تەنها ئەبیت سەیری دوور بکات و هیچی تر ، بێ ئاگالەوەی کە هەر لەلای خۆیەوە ئەتوانێت بەو شتە بگات کەچەندە خۆی بۆ ماندوو کردووە، ئاسودەیی بە مانایەکی تر بەختەوەری ، ئەوەندە لێتەوە نزیکە ئەگەر بانگی بکەی وەڵامت ئەداتەوە بەڵام بەهۆی ئەوەی لەبەر

بەردەوامیت لەسەر خەمخواردن و سارد بوونەوە لە گەڕان بەدوای بەختەوەری گوێچکەکانت کەمێك گران بوون و گوێت کەمتر لێی ئەبێت ، وە بەختەوەری نایەت بۆلات تا هەمیشە بەخەبەر نەبیت ،چونکە بەختەوەری ئەو کاتێك دێت کە تۆ لە قەڵەبالغی دەروونت دا خەوت لێکەوتوە ، بۆ هەر گەڕانێك پێویستە لەوە بێ خەبەر نەبیت کە تۆ بەدوای بەختەوەری گەڕاویت و ئەویش بەدوات دا دێت بۆیە هەوڵ بدە هەمیشە بە خەبەر بیت چونکە بەختەوەری زۆر بە هێمنی لە دەرگات ئەدات ، زۆرینەی خەڵکی ئێستا ڕایان وایە کە بەختەوەری پەیوەندی بە شانس و نێو چاوانەوە هەیە ، بەڵام ئەو بیر کردنەوەیە زۆر نا ئاساییە ،لەبەر ئەوەی کەسی ورد بین هەرگیس بەو شێوەیە بیرناکاتەوە ،وەبەجۆرێك بیر دەکاتەوە کە هەر کێشەیەکی بۆ دروست ببێت و ببێتە مایەی خەم و پەژارەبۆی ، ئەو کاتە دڵنیایە کە حیکمەتی لەدواوەیە و بەوردی لێی ئەڕوانێت و چارەسەری دەکات بە لێزانی خۆی ، بۆیە لە چەند دێرێك دا دەڵێین:

بەدوای بەختەوەر مەگەڕێ لە دوور
لـــەخۆت دایـــە لـــە دیـــوی ژوور
هۆکاری چیە کەوا نای بینـــی
بگا بەدەست و خۆشی ببینی
بەوردی سەیر کە تا کو لات ڕوون بێ
نەوەك بەگللەیـــی لەنەفست ون بـــێ
بەدەستت هێنا تەقوای خوا بکە
با هەر لەلات بـــێ نەوەك ڕابکا.

## كێن ئەو کەسانەی کە ئاسودەو بەختەوەرن ...؟:

بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەو ڕێگەیەی کە هەنگاومان هەڵگرتووە بۆی تا بگەین بە بەختەوەری و دورکەوتنەوە لە دڵ تەنگی ،باشترە چەند زانیاریەك لەسەر کەسە بەختەودرەکان بزانین تا زیاتر ناسراو بن لامان، کەسە بەختەوەرەکان ئەو کەسانەن کە خودای گەورە بەهرەمەندی کردوون لە بەخششێکی خۆی و بە ختەوەری پێ خەڵات کردوون ، گاڵتەیان بە ڕووداوە ناخۆشەکان دێت و ڕووداوەکانیان لا ئاساییە،با ئەو پەڕی بڵێسەی ئاگر فڕێ بدات ، بەدەم ژیانەوە پێدەکەنن و لایان وایە نەباران بووە نەبا، با چنگ و نینۆکی نەزان و دڵ ڕەق و بێ بەزەییەکانیش بەردڵیان کەوتبێت ئەوان هەربەردەوامن لە هەڵکێشانی هەناسەی صەبر و ئارامی وە ئەگەر بێت و گەورەترین شتیش لەدەست بدەن هەر دەڵێن (**إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾البقرة**)،هەتا ئەوەندەی پێناچێ ئەو بەڵاو موسیبەتەی کە لەسەریانە دەگۆڕێت بۆ ئاسودەیی و خۆشی ،وە شوکرانە بژێری بەهرەکانیش دەکەن ئەمە لە کاتێك دایە کە ئەو جۆرە بەڵاو موسیبەتانە لە خەڵکانێکی تردا هاوار و ڕۆ ڕۆ و دەنگیان لێ بەرز دەکاتەوە، هەربۆیە شارەزابوون لەم جۆرە کەسانە جۆرە تەجروبەیەکت بۆ دروست دەکات کە بتوانی لەژێر ڕۆشنایی ئەم تەجروبەیە ڕێگەکانت ڕۆشن بکەیتەوە کە هەنگاوت بۆیان ناوە.

## چ ڕۆژێك ڕۆژی بەختەوەری مرۆڤە یاخود جەژنی مرۆڤە ؟:

هەر تاکێك بەپێی توانای خۆی ڕۆژانە هەڵە دەکات ،وە ئەوانەی کە بیردەکەنەوەو لەکردەوەکانیان ئەپێچنەوە زۆر ویژدانیان ئازاریان ئەدات لەسەر کردنی ئەو هەڵانە، بۆیە باشترین ڕۆژ ئەو ڕۆژانەن کە هەڵەی کەم تێدا کردووە ، هەڵەکردن خۆی لە خۆی دا کردەوەیەکە کە ئادەمیزاد ئەنجامی دەدات هەڵەکە بەسەر دەچێت و دەبێتە ڕابردوو بەڵام پاشماوەکەی لە دەرون دا بەجێدەمێنێت ،و کاریگەری لەسەر ئەنجام دەرەکەی بەجێ دەهێڵێت تەنانەت لەکاتی خەوتنیش دا خەوی بە ئەستەم لێ دەکەوێت یاخود لە خەویشدا خەوی نا خۆش دەبینێت یاخود سود لەخەوەکەی نا بینێت و وەك بڵێی هەر نە خەوتوە ،ئەمە وای لێ دەکات لەو ڕۆژەدا ئاسودەیی خۆی ون بکات و نەتوانێت هەست بەئارامی بکات ،بۆیە دەبێت ئەوەش بزانین ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ لەلای جەژنە و خۆشیە پەیوەندی بەناوی ڕۆژەکەوەنیە بەڵکو پەیوەندی بەخودی کردەوەکانیەتی کەلەو ڕۆژە دا ئەنجامی داوە ،بۆنمونە کەسێك چەندین کاری نا بە جێی کردووە و لەدڵەوە ڕۆژی ڕوناکی لێبووەتە تاریکە شەو ،با بەیانیش ڕۆژی جەژن بێت کە هەموو خەڵك تێیدا جل و بەرگی نوێ لەبەر دەکەن و دڵیان خۆشە ،بۆ ئەو هەر دڵتەنگیە نەك شتێکی تر بۆیە ئەلێرەدا ئەوەمان بۆ ڕون بۆوە ناوی ڕۆژەکە کاریگەری نەبوو لەسەر دڵخۆش بوونی کەسەکە، لەهەمان کاتدا ئەگەر جەژنیش نەبێت بەڵام ئەو دڵی ئاسودەبوو وە هیچ کردەوەیەکی نابەجێی نەکردبوو، خۆی لە شوێنی خۆیەوە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بوو بێت دڵی خۆشەو لێوبەخەندەیە و ڕوخساری ئەگەشێتەوە ، لەگەڵ هەموو ئەم شیکردنەوەیەشمان دا، دەڵێین ڕۆژێکیان پرسیار لە شێخ حەسەنی بەصری ئەکرێت و پێی ئەڵێن : چ ڕۆژێك جەژنی تۆیە ، ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: ئەو ڕۆژە جەژنی منە کە گوناهی تێدا نەکەم بۆیە بالەوە دڵنیابین چ ڕۆژێکمان ناو بنێین جەژن.

## مژدەیەکی خۆش بۆ کەسانێك کە سەرگەردان بوون بەخەم خواردن:

باشتێك بەبیر خۆمان بهێنینەوە لەو شتانەی کە دڵ ئاوەدان دەکەنەوە ، با زۆربەمان دڵمان تەنگ بێت ، و خەفەت باری میوانی هەمیشەییمان بێت یان ڕێگەی خۆمان ون کردبێت لەبەر تەم و غوباری خەم بۆیە ئەمەش یەکێکە لە بەخششەکانی خوای گەورە کەویستی لەسەر ئەوەیە ،لەدونیا دا دڵمان توند بێت و لە دوارۆژدا دڵمان خۆش بکات بە بەخشش و پاداشتە نەبڕاوەکانی ، لەبەر ئەوەی ژیانی دونیا لەگەڵ قیامەت دوو جیهانی جیاوازن بەڵام هاوسەنگی یەکن بەمانایەکیتر یەکتر تەواو دەکەن لەزۆر ڕووەوە، یەکێك لەو ڕووانە ئەوەیە ئەگەر کەسێك لەدونیادا زۆر خەم باربێت یاخود چەرمەسەری و دڵتەنگی ببینێت ئەوا ئەوا لە قیامەتا دڵخۆش دەبێت وە بەپێچەوانەشەوە ، ئەگەر لە دونیادا لەخۆشیدا ژیا بێت ئەوە لە قیامەتا ناخۆشی دەبینێت بەمەرجێك ئەگەر سوپاسی خودای نەکردبێت لەسەری، بۆیە ئەم دوو ژیانە وەکو هاو کێشەیەکن یەکتر هاوسەنگ دەکەن با گوێ لەبەسەر هاتێك بگرین کە بەسەر پیاوێکی زۆرداناندا هاتووە:- ئەویش مالیکی کوڕی دینارە کە دەفەرمووێ: جارێك خەوم بینی لەخەوم دا(شێخ حسنی بصری)م بینی زۆر جوان و ڕوخسار گەشاوە بوو،تابڵێی نوورانی بوو،شوێنەواری فرمێسکەکانی دونیای هەموو ڕوخساری ڕەونەق دار کردبوو ، پرسیارم لێی کرد ئایا تۆ نەمردبووی لەلای ئێمە ئەی ئەبوو سعید؟ گوتی : بەڵێ، گوتم: لەدوای مردن چیت بەسەرهات لە خانوی دوا ڕۆژ ،چونکە تۆ لەدونیادا زۆر غەمبار و دڵت هەمیشە عاجز و پڕ لە خەم و خەفەت بوو ؟!

گوتی:بەهۆی ئەوەیان لە پاداشتی ئەوەوە چومە ڕێزی و ماڵەکانی چاکان و پارێزکاران چونکە لەدونیادا زۆر دەگریام و دڵم توند بوو خەفەتم دەخوارد ،سوێد بە خودا ئەوەش

لەفەزڵی خودایە بەسەرمانەوە کەپێمانی بەخشی، گوتم:ئەی ئەبوو سعید فرمانی چیم پێ دەکەیت؟ گوتی: ئەوەی فەرمانت پێ دەکەم ئەوە بکە ،هەرکەسێ زۆر لەدنیادا دڵ پڕ خەم و نارەحەتی و هەمیشە خەمبار بێت ،ئەوا لە دوا ڕۆژدا لەهەمموو کەس دڵی خۆشتر و بێ خەمترە.[١] هەربۆیە ئەمەش مژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ ئەوکەسنەی کە بەو شێوەین، خودای گەورەش بەلوتفو کەرەم وبەزەیی خۆی ئەوەمان پێ ببەخشێت کەخۆی پێی باشە.

## زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژەکانمان بەختەوەریە بەڵام هەستی پێ ناکەین:-

بەڕاستی چەندین خۆشی هەیە کە ڕۆژانە لێیان بەهرەمەند ئەبین ،کەچی پێیان ئاگەدارنین وەکو ئەوەی :

هەر لەسەرەتای ڕۆژدا کە لەخەو هەڵ دەستی سەیرکە کەخودای گەورە دووبارە چ شتێکی پێ بەخشیوە ،دووبارە مۆڵەتێکی تری پێت داوە ، تا ئەو کارانەی نەت کردووە ئەنجامیان بدەیت وکارە تەواونەکراوەکان تەواو بکەین، وە لەهەمووشی گەورەتر ئەوەیە تۆ دووبارە کاتت پێدراوە بۆ کردنی کردەوەی چاك تا خودا لە خۆت ڕازی بکەیت و ڕەزامەندی ئەو بەدەست بهێنی ، بەڕاستی ئەوە بەختەوەریەکی گەورەیە،گەر بێت و هەستی پێ بکەی، لەلایەکی تر ئەو ڕۆژەی کەتێیدای ئەگەر لەش ساغ بیت ئەوە چ شتێك هەیە لەتەرازوو دا هاوسەنگی پێ بکرێ لەگەڵ لەش ساغی دا ؟ نیعمەتێکە ئەتوانرێت بەشێوەیەك لێی بڕوانرێ کە هۆیەکی گەورەیە بۆ بەرپابوونی دڵ خۆشی و ئاسوودەبوون چونکە بێنە پێش چاوت ئەگەر بێت و نەخۆش بویتایە و ڕۆژو شەوت لەسەر جێگەکەت بەرێ بکردایە ئەو کاتە ژیان چ تامێکی ئەبوو تا هەستی پێ بکەی بۆیە ئەمەش بەشێکی ترە لە بەختەوەریەکان کەلەڕۆژێك دالێی بەهرەمەندین و

---

١ - صحيح وصايا الرسول،المجموعة الثانية – بەرگی ٣ لاپەڕە (٣٦٩)،نوسینی(سعد يوسف ابو عزيز).

لەبیرخۆمان بردووەتەوە ، وە یەکێتر لەو بەختەوەریانەی کە لەبیرمان چوەتەوە ئەوەیە، نەبوونی کێشەیە،بزانە ئەگەر تۆ خاوەنی کێشەیەکی گەورە بویتایە و نەتزانیایە شەو لەکوێیە و ڕۆژ لەکوێیە لەبەر ئەو کێشەیەی کە توشت بووە ،ئەو کاتە خۆشی و لەزەتەکانی ڕۆژت لەکوێ ئەبوو ، بەڵام ئەگەر خاوەنی ئەوکێشە گەورەیەش نیت تۆ سەرت سوکە ،کەواتە چ شتێك هەیە هێندەی ئەوە ئاسودە بەخش بێت کە خاوەنی کێشەی گەورە نیت و بێ خەم شەو بکەیتە ڕۆژ و ڕۆژیش بکەیتە شەو،بۆ زانینی تامی بێ کێشەیی بڕۆ پرسیار لەو کسانە بکە کە توشی بەڵای خۆیان بوون ئەو کاتە پێت ئەڵێن کە چەندە دڵی لەقەلەقی دا خەریکە ئەوەستێت و بەحەسرەتی ئەوەیە ڕۆژێك زووتر ئەو کێشەیەی لە کۆڵ بێتەوە،جا بۆیە ئەوەش شتێکی زۆر بەرچاوە کە نابێت لێی بێ خەبەر بیت و نەزانی بەختەوەریەکەت چی بەسەر هاتووە، ئەم ئاگەداریانەو چەندانی تر کەخۆی لە خۆیدا بەختەوەین بەڵام لەبەر چەند هۆکارێکی تری لاوەکی لێی بێ هەواڵین.

## دەست پێك و ناونیشانی بەختەوەری لە سێ شت دایە :

ئیمامی کوڕی القیم(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:دەستپێکی ناونیشانی بەختەوەریەکانی مرۆڤ سێ شتی گرینگە: یەکەم: کاتێ خودای گەورە بەهرەمەندی و دەست ڕۆیشتوویی و دەوڵەمەندی و سەروەت وسامان داری کرد،شوکرانەی نیعمەتی ئەو بکات و سوپاس گوزار بێت.

دووهەم: کاتێك مرۆڤ بەڵاو موسیبەتێکی بەسەردێت با لە ئەو پەڕی ناخۆشی و تاڵی و نالەباری بێت، بەڵام ئەو هەر سەبر بگرێت و دان بەخۆی دابگرێت.

سێهەم: کاتێك مرۆڤ پێی دەخزێ و دەکەوێتە تاوان و گوناهێکەوە یەکسەر فریای خۆی بکەوێت و پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەی بۆلای خودای گەورە بێت، ئەنجام دانی کرداری باش و چاك بەدوای دا بهێنێت بۆئەوەی ببێتە هۆی سڕینەوەی خراپەکانی،وە لەگەڵ ئەمانەش دا دەفەرمووێ: ئەم سێ خاڵە بریتین لە ناونیشان بۆ بەختەوەری و ئاسودەیی و سەرفرازی بەندە لە دونیاو دوا ڕۆژدا، وەبەهیچ شێوەیەك لێی نابێتەوە،بۆیە کارێکی زۆر شیاوە ئەنجام دانی ئەم سێ خاڵەی پێشوو بۆ دەست پێکی هەموو کردەوەکان.

## چەند سودێك لە سودە نەژمێردراوەکانی بەختەوەری بوون :

ئێمە ئەگەر بمانەوێت بەپێنوسەکانمان چەندین کتێب بنوسین بۆ باسکردنی سودو قازانجەکانی بەختەوەری بوون، ئەوە هێشتا حەقی تەواومان پێ نەداوە جا بۆیە بەکورتی ئەم چەند خاڵە دەنوسین و دەڵێین:

١- بەختەوەری ئارامیەکی دەروونی و فراوان بوونێکی هزری لەڕادەبەدەر بەمرۆڤ دەبەخشێت.

٢- بەختەوەری هۆکاری سەرەکی بڵاو بوونەوەی خۆشەویستی و شادی خستنە ناو ڕۆحی تاك و خێزانە بۆ بەردەوام بوونیان لەسەر بەرێکردنی ژیانێکی ئاسودە.

٣- بەختەوەری سوتەمەنی بە گرخستنی هەوڵدانی مرۆڤەکانە بۆگەیشتن بەئامانج و هیوا بەرزە بێ وێنەکان.

٤- بەختەوەری کلیلی دەرگای گەڕان و پشکنینە بۆ دۆزینەوەی ڕەوشت و بەها جوانەکان کە مرۆڤ تێیدا ڕازاوەو ڕەزامەند ئەبێت.

٥- بەختەوەری دەرفەت بۆ تاك ڕێك دەخات تاوەكو داهێنەر و بەهرەمەند بێت بەشێوەیەك كە پشت تەنیا بەو شتانە ببەستێت كە خۆی دای هێناوە واتا بەدوورە لە كۆپی كردن.

٦- بەختەوەری بەیەكەوە گرێدانی كۆمەڵگایەكی بڵاوەبووە كەشەوی تاریكی بوغز باڵی كێشاوە بەسەریاندا وای لێدەكات بەڕوناكی موسیبەتی ئاشتەوایی ڕوناك ببێتەوە.

## هەبوونی كات خۆی لەخۆی دا بەهرەی بەختەوەر بوونە :

كات بەشێكی گەورەی ژیانەو تەمەن پێیەوە بەندە، ئەوەی بتوانێت هەڵی بقۆزێتەوە، ئەو كاتە ئەستەمە بزانێت دڵتەنگی چیە تا بەهۆیەوە لە خۆی بێزاربێت، هەروەكو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ (اغتنم خمسا قبل خمس شبابك قبل هرمك وصحتك قبل سقمك وغناءك قبل فقرك وفراغك قبل شغلك وحياتك قبل موتك)[1]. واتە:پێنج شت بەدەست بێنن پێش پێنج شت : گەنجی پێش پیری ، لەش ساغی پێش نەخۆش كەوتن،دەوڵەمەندی پێش هەژاری ، دەست بەتاڵی پێش سەرقاڵی ،وەژیان پێش مردن)،ئەمەش واتا بەختەوەریەكانت بەدەست بێنە پێش هاتنی تاریكی شەوی نابەختەوەری،لەبەرئەوەی ئەگەر گەنجی لەبیرت بێ پیری هەیە، ئەگەر لەشت ساغە نەخۆش كەوتن هەیە ئەگەر لەڕووی داراییەوە باشی ئەوە هەژاریش هەیە ، وە ئەگەر كاتی بەتاڵت زۆر هەیە بەچاكی پڕیان بكەوە چونكە سەرقاڵی هەیە كەوات لێ دەكات بەهیچ شتێكت ڕانەگەیت ، وە ئەگەر ئێستا لە ژیاندایت لەبیر نەكەی مردنێك هەیە كە هەر ئەبێت ڕۆژێك ببینی بۆیە ئەم ژیانەی ئێستات بكە بە كێڵگەیەك بۆ چاندنی

---

١- رواه النسائي والبيهقي،وفي عون المعبود شرح سنن أبي داود لاپەڕە (١٨٧)جلدی ٨.

کردەوە باشەکانت،و ئەو دونیاش بکە شوێنی دروێنە بۆ بەدەست هێنانی فیردەوسی ئەعلا.

## پڕکردنی کات لە فێر بوون ژماردن و ناسینی خەمەکانت لەبیر ئەباتەوە:

فێربوونی زانست ئەو حاڵەتەیە کە ئەگەر مرۆڤ تێیدا بەهرەمەندبێت ئەوە ئەبێتە خاوەنی زۆرترین شت،وە وای لێ دەکات زۆر بێ ئاگابێت لەوەی کەچ خەمێکی هەیە،لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ ئاگاداری ئەوە بێت کەچ خەمێکی هەیەو زۆر بیریان لێ بکاتەوە ئەوا بەڕاستی کاتێکی زۆری لێ بەفیرۆ ئەدات لای هەمووشمان ئاشکرایە کەکات یەکسانە بەتەمەن ، هەرکەسێك هەموو فیکر و هۆشی لەناو فێربوون دا نقوم بکات و مۆڵەت بەخۆی نەدات یەك زانستیشی لە دەست دەربچێت لەبوارەکەی خۆیدا، ئەو ساکە بەبێ شك ئەبێتە مرۆڤێکی تابلێی دوورە خەم و ڕێگەی ئاسودەیی خۆی لێ ون نابێت،وە پڕکردنەوەی کات بەفێربوونی بابەتی بەسود بەهرەیەکە هەموو کەسێك نابێتە خاوەنی تەنیا ئەوانەی خۆیان یەکلا کردوەتەوە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی و لەپاشدا بەختەوەری بوونی، خۆ دوور خستنەوە لە فێربوون وەکو کەسێکی نەخۆش وایەکە بەردەوام لەناو جێگەکەی دا ڕاکشاوە و کات لای زۆر بەزەحمەت ئەڕواتە پێشەوە، چونکە بەهیچ کارێکەوە سەرقاڵ نیە و هەر کات لەچاوەڕوانی دەباتە سەر کە ئاخۆکەی دەگات بە چاك بوونەوە، بەهەمان شێوە بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری و دورکەوتنەوە لە دڵتەنگی، ئەتوانی هەنگاو لە ڕێگەی فێربوون هەڵگری بەسەر قاڵی و بەردەوام بوونت لەسەر ئەم کارە، بەڕاددەیەکی بەرچاو لە خەم دا دەبڕێت و زۆرێکیانت لە بیر ئەچێتەوە کاتت نا بێت بۆ بیر لێ کردنەوەیان،

خۆشت نازانی چەنت ڕێە بڕیوە و نەوەنەت نەماوە دەگەیت بەهیواکانت و ئاسودەیی بۆ خۆت بەدەست دەهێنی : بۆیە

ئەوکاتەی ئێستا لەبەر دەستتایە

ئاگەداری بە مۆڵەتـــی خوایـە

نەکەی بـێ هودە بەفیڕۆ بچـــێ

غافڵبی لێی و خۆت لەبیر بچێ

حەکیم کەسێکە چرکەش نەچوێنێ

لەگەڵ هەر چرکەو عەقڵ بدوێنـێ.[1]

بۆزیاتر هەست کردن بەخودی خۆمان کەچەندە لەپڕکردنەوەی کاتەکانمان کەم تەرخەمین ئەچینە لای پەڕە ڕەنگینەکانی مێژووی ڕابردوو کە پێشینەکانمان چ جۆرە ڕێزێکیان لە کاتەکانیان گرتووە و نەیان هێشتووە بچوکترین هەلیان لە دەست بچێت بۆ پڕکردنەوەی کاتەکانیان بە فێربوونی زانست، چەند کەڵە پیاوێکیان لێ باس دەکەین:

یەکەم: زانای کورد( إبن تیمیە)ئەم زانایە گەورەیە هیچ کاتی بەفیڕۆ نەدەدا یان لە نوسین یان لە پەرستن هەتا پەرتوکەکانی زیاد لە سەدەها پەرتوك دەبوون، تەنانەت خۆیشی نەی ئەزانی چەندە،ئیمامی(زەهەبی)دەڵێت:نوسینەکانی ئەم کەڵە پیاوە نزیکەی سێ سەدبەرگە،

---

١ – (نوسـەر) لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی دووهەم.

ئیبن قەییم دەڵێت: من لەبەهێزی شەیخم دەبینی لەقسەکردن و تارو نوسین تەنانەت لە ڕۆژێکدا ئەوەندەی دەنوسی کە لەبەر گرەوەکانی لە حەفتاو ئەوەندەدا سپی نوسیان دەکردەوە.ماشاالله لەم بەهرەمەندیە!!!

دووهەم:کوڕی (جەریری تەبەری) خوا لێی ڕازی بێت ،ئیمامی غەلیبی بەغدادی لەباسی ئەودا دەڵێت: گوێم لە (سمسمی)بووە کە دەیگێڕایەوە کوڕی (جەریری تەبەری) چل ساڵ بە بەردەوامی هەر ڕۆژەوچل لاپەڕەی دەنوسی.یەکێك لە قوتابیەکانی بە ئەلفارغی لە پەر توکێکی بەناوی (الصلة)کە پەرتوکە گەورە کەی کوڕی جەریری بەیەك دەگەیەنێتەوە دەڵێت: هەندێك لەقوتابیانی کوڕی جەریری پەڕاوەکانی نوسینی کوڕی جەریریان لێکدایەوە لەو ڕۆژەی وا لە باڵغ بووندا بووە تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کردووە کە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵ ژیاوە، لە هەر ڕۆژێك دا چواردە لاپەڕەی نوسینی بەر ڕۆژەکانی ژیانی کەوتووە، بێگومان ئەمە بۆ هیچ کەسێك نابێت مەگەر خودای گەورە خۆی یارمەتی دەری مرۆڤ بێت و بەرەکەتی خۆی بکاتە کاتیەوە،ئەگەر پێش باڵغ بوونی لێ دەربهێنین واتە تەمەنی حەفتا ساڵی بۆ بژمێردرێت کەواتە لەو تەمەنەی دا سێ هەزار و پەنجاو هەشت لاپەڕەی نوسیوە.

سێهەم: (ئیبن الجوزی ئەلبەغدادی):زۆر پارێزگاری لەکاتەکانی خۆی دەکرد و چاودێری لێ دەکرد، ئەمەش زۆر بەرچاوەو دیارە کاتێك دەڕوانێتە بەرهەمەکانی نەوەیەکی بەناوی (مظفر الجوزی)دەڵێت: گوێم لە باپیرم بووە لەسەر مینبەر دەیووت لە کۆتاییەکانی ژیانی دا بوو بەم پەنجانەی خۆم دوو هەزار موجەلەدم نوسیوە، وە کوڕی(ڕەجەبی حەنبەل) دەڵێت: لەپەرتوکێك کە ئیمام(إبن تیمیە) لێی پرسرا لەمیسر دا دەربارەی (ئیبن الجوزی) لەوەڵامدا وتی: ئیبن الجوزی ئەلبەغدادی زۆر نوسینی هەیە، لەهەموو بوارەکاندا هەتا

ژماردوومه زیاتر لەهەزار پەرتووك لەپاش ئەوەش دا پەرتوكی ترم دەدی كە لەوەو پێش نەم دیبوو.بۆیە دەبێ خۆمان لیّ ون نەبێ لەناو كاتە بیّ كارەكانمان و بەردەوام خۆمان ڕابێنین لەسەر پڕكردنی كاتە بەتاڵەكانمان.

**قورس ترین و سوكترین شت لەسەر بەندە كە كە خەم دەڕوێنن و دواتر دروێنەی دەكەن :**

سلمی دەڵێ: خوشكی (بەشیری الحافی) گوتی: قورس ترین شت لەسەر بەندە گوناه و تاوانە كە دڵ توندی بۆ دەهێنن، وە سوكترین شت لەسەری تۆبەكردنە، بۆچی شتە قورسەكەی كە گوناه وتاوانە لای نابات بە شتە سوكەكەی كە تەوبەكردن و پەشیمانیە لە سەر كردەوەی خراپ[1] .

**هەوڵبدە لەم جۆرە بەندەیە بیت، ئەمە دۆزینەوەی بەختەوەری ڕاستە قینەیە :**

خودای گەورە جۆرە بەندەیەكی هەیە كە بەربەستە كانی ئارەزوویان بڕیوە، ئاوزەنگی تێكۆشانیان لێداوە بەعەزمی ڕاستەوە سواری ئەسپی هیواكانیان بوون و بەرەو گەیشت بە خودا كەوتۆتنە ڕێ،تێشووی كردەوەی چاك و پوختی مەبەستیان هەڵگرتووە، هۆكاری دڵپاكی و ڕاستگۆییان گرتۆتە بەر، كاتێ بەلای سەوزایی دڵ ڕفێندا تێدەپەڕن تەسبیحات دەكەن، بەلای داری گڕگرتودا دەڕۆن خۆیان دەپارێزن،گوێ نادەنە بەربەستەكان، ئاوڕ بۆ شتە مردووە كان نادەنەوە ڕووی خۆیان دەپارێزن لە زەردی،پێیان پاك دەكەنەوە لە قوڕو لیتەی گوومان،پشت بە خودا دەبەستن لە نارەحەتی وتاڵاوی ڕێگەوخوداش تەنگیەكانیان بۆ ئاسان دەكات و لە دووری ڕێگەش فراوانی مەبەستیان بۆ كۆ دەكاتەوە، كاتێ كۆسپەكانیان دەبینن،داوا لە خودا دەكەن و لێی دەپاڕێنەوە ئەویش دەرگاكانیان بۆ واڵا دەكات،كاتێ دەڕۆنە ژوورەوە میوان داریان دەكات و پەردەیان لە ڕوو لا دەبات، كاتێ

---

[1] - صفة الصفوفه إبن الجوزي، بەرگی(٢) لاپەڕە (٥٢٦).

ماندوویان دەرچوو پاش درێژی ماوەی ڕێگا،دەڵێن(الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ) الزمر(٧٤)،ئائەمانە خۆشەویستانی خوان ڕاستیان کرد لەگەڵ خوداو ئەویش خەڵاتی کردن، هەرلەوێدا فریشتەکان دەبینن(حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ) الزمر(٧٥)،ئا لەوێدا بەختەوەری ڕاستە قینە بەدەست دێنن چونکە لە دونیادا بەدوای دا هاتن و شەو و ڕۆژیان دابوو بەدەم یەکەوە.

## بەدەست هێنانی بەختەوەری هەردوو دونیا:

هەرکەسێك لەم ژیانەدا بۆ ئەم وشە پڕشنگدارە بژیێت و هەوڵو تێکۆشانی بۆ بکات و بمرێت، ئەوا ژیانی نەبڕاوەی هەمیشەیی لەقیامەتدا بەدەست دەهێنێت(وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ) النازعات(٤٠) واتا:هەرکەسێك خودای خۆی خۆش بوێت و ملکەچی بێت وە ڕێگری لە سەر کەشی دەرونی بکات،ئەوا لە ڕۆژی دوایدا پاداشتی بەهەشتی بەرینە بە بەختەوەری تێیدا دەژیێت، وە لە ژیانی ئەم دوانیادا لە بە هەشتی گەڕان و پشکنین و دۆزینەوەی ڕاستی حەق و دات پەروەری دا ژیاوە، بەهەشتی تامەزرۆیی و بۆدیداری ڕاستەقینەی خودای گەورە ژیان لە ژێر سایەی ڕەزامەندی دایە،ئەمە سروشتی سەرەتایی هەموو خۆشیەکە لە ژیاندا، کە پێشەکیەکەی بە هەوڵ و ماندوو بوون و شەوخونی و ئارامگرتن دەست پێ دەکات وە لە کۆتایی دا بەختەوەری بە دەست دەهێنێت، هەرچەندە خوانەناسان لە خۆشیەکانی ژیان دابن، بەڵام ژیانیان بێ ئامانجە و بێ ئاکام و بێ مەبەستە ئەگەر مەبەستیش هەبێت ئەوە مەبەستێکی پوچە، وە خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموویێت(مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً )النحل(٩٧).واتە: هەرکەسێك کاری چاکە خوازی بکات و بڕوا دار بێت ئەوا ژیانێکی پڕ بەختەوەری پێ دەبەخشین.وە بە ختەوەری ژیان بریتیە لە بەهەشتی

دونیا هەروەکو خودای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە و دەڵێ:( **فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ۖ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ** )( ١٢٥ ).واتە: هەرکەسێك خودای گەورە بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوا سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئیسلام، ئەو کەسەشی خودای گەورە بیەوێت گومڕای بکات، ئەوا دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت ، هەروەکو بڵێیت بۆ ئاسمان بەرز بکرێتەوە.بۆیە ئەم پەیامە پیرۆزە هەروەکو چۆن ڕۆشن کەرەوەیە بۆ کەسێك کە دەستی پێوە گرتووە بەو شێوەیەش تاریك پۆش و سەرلێشێوێنە بۆ ئەو کەسەی کە دەستی پێوە نەگرتووە.

## ( هەندێك لە هۆكارەكانی دڵ تەنگی )

ئەلێرەدا دەتوانین چەند هۆكارێكی بەرچاو و دیار بە پێی توانا بخەینە ڕوو لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتە پیرۆزەكانی خودای پەروەردگار و فەرموودە نازدارەكانی پێغەمبەرمان ﷺ، كە ئەو هۆكارانە بە شێوەیەكی بەربڵاو دیار و باون و باڵیان كێشاوە بەسەر هەموو لایەكی ناخی تاكەكا

ن كەئامادەكاریەكی زۆر دەكەن بۆ دروست بوونی نائارامی لەدەرون داو لە بیركردنی تامی خۆشیەكان بۆیە لێرە دا باسیان لێوە دەكەین تاپتر ئاشنایە تیمان هەبێت بەئەو سەر چاوانەی كەوا لەكەشی دڵ دەكەن پەژارەی لێ هەڵ بقوڵێت:

**یەكەم:** خاڵێكی هەرە سەرەكی سەرچاوەی نائارامی و لەدەست دانی ئاسودەیی دوركەوتنەوەیە لە یاد و زیكری خودای پەروەردگار، یادكردنەوەی پەروەردگار جۆرە ئارامیەك لەدڵدا دەهێنێتە كایەوە كە نە بە قسەو نە بەنوسین ناتوانرێت وەسفی تەواوی پێ بدرێت،ئەوكەسەی بەردەوام خۆی بەیادو زیكری خودای پەروەردگارەوە سەرقاڵ كردوە ئەوە هەرگیس خەمی دونیایی ناتوانێت ئەو ئارامیەی لێبسەنێتەوە، هەروەكو خودای پەروەردگار دەفەرمووێت(الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)الرعد( ٢٨ ).واتە:ئەوانەی كەدەگەڕێنەوە بۆلای خوا ئەوكەسانەن كە بڕوای چاك و پوختیان هێناوە،و هەربە ئیتاعەو یادی خوایش دڵیان دادەمەزرێ و ئاسودەدەبێت،جا چاك بزانن! بەیادی خودا دڵەكان ئۆقرە دەگرن و ئاسودە دەبن.

جا بزانە ئەوانەی كە دوورن لەو كردەوە پیرۆزە چەندە نەفەسی بەختەوەریان تەنگە و ناتوانن هەناسەیەكی پڕلەئاسوودەیی هەڵمژن، بەدوركەوتنەوە لەم یاد و زیكرە،توشی

چەندان کێشەی دەرونی دەبێت و سەرئەنجام نازانێت لەکوێوە بۆی دەچێت،هەروەکو لە نایەتێکی تردا خودای پەروەردگار بەبیرمان دەهێنێتەوەو دەفەرمووێت(**وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ** )﴿١٩﴾ الحشر.

واتە:ئێوە وەکو ئەو کەسانە مەبن خوایان لەبیر کردبوو گوێیان بە فەرمانەکانی نەدەدا، ئینجا خوایش سەرگەردانی کردن خۆیان لەبیرکردو نەیان زانی کارێکی وا بکەن لەپاشە ڕۆژدا سودیان پێ بدات،بۆیە بەڕاستی دوورکەوتنەوە لەم یادە وا لە مرۆڤ دەکات تەنانەت خۆشی لەبیر بچێتەوە و دوارۆژیشی لەبەرچاو نەبێت، وە بۆئەوەی زیاتر هەست بەسەنگینی ئەم پەیامەبکەین کە چەندە پێویستە لەگەڵی تێکەڵاو بین، ئەبێت خۆمان لەم هەڕەشەیەی خودای پەروەردگار بپارێزین کەسەبارەت بەو کەسانەی بەتەواوی واز لەزیکر و یادو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەهێنن،کەدەفەرمووێ(**وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ** ﴿١٢٤﴾**طه**)واتە: هەر کەسێك لەم قورئانە ڕوو وەرگێڕێ ئەوە بێگومان ژیانێکی سەختی دەبێ،هەرچەندە خاوەنی دونیاش بێت،وەلەڕۆژی دواییشدا بەکوێری حەشر و دادگایی دەکەن .چونکەمرۆڤ هەرکە پەیوەندی لەگەڵ خودا پچڕا دڵی تەنگە،بچوکە، بێئارامە، هەرگیس تێر نابێت .

**دووەهەم:** زۆر خۆش ویستنی دونیاو حەزنەکردن بە بەجێهێشتنی، ئەمەش هۆکارێکی زۆر گەورەیە بۆ دروست بوونی قەلەقی وخەم باری لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی کە هەمیشە دەستی بەدونیاوە گرتووە و توند و سوورە لەسەر واز نەهێنانی و مانەوە تیای، ئەوە لەدڵەوە زۆر نائاسودەیە و نازانێت چی بکات تا نزیك نەبێتەوەلە ڕاستیەك کە ئەویش مردنە،چونکە مردن هەموو شتێك لە مرۆڤ دەسێنێتەوە کە خۆی بە خاوەنیدەزانێت، وە تاکە هۆکاریش بۆ حەزنەکردن بەبەجێ هێشتنی دونیا،خۆ ئامادە نەکردنە بۆ دوارۆژ کە دڵ نیاشە هەر ڕۆژێك بۆی دێت و ئەبێت ئەم فەرمانە جێبەجێ بکات جا بەخۆشی بیت یاخود نا، هەروەکو ئیمامی (احمد) خوا لێی ڕازی بێت،لە تاوصی یەمانی دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إن الزهد في الدنيا يرح القلب والبدن، وإن الرغبة في الدنيا تطيل الهم واحزن)[1].واتە:بەڕاستی واز هێنان و زوهد لەدنیا دا دڵ ئارام دەکات و حەسانەوەی پێ دەبەخشێ،بەڵام خۆشەویستی و تامەزرۆبوون بۆ دونیا پەژارەی زیاد دەکات و درێژی پێ دەدات.

جا بزانە چەندە حەزبەدونیا بکەی ئەوەندەش خەم باری ئەکەیتە کۆڵتەوە، وە چەندە خۆت بۆ دوا ڕۆژ ئامادە دەکەیت ئەوەندە دڵ ئارامترو ئاسودەتری لەچاوکەسانی تردەوە.

---

[1] ـ الزهد للأمام احمد بن حنبل(١٠).

**سێهەم**: مرۆڤ لەیەکێك لەو کاتانەی کە دڵی زۆر تێیدا توند دەبێت ئەویش ئەوکاتەیەکە ئارەزووی دەوڵەمەندی بکات و هەمیشە لەهەوڵی پەیاکردنی سامانو دارایی دابێت،وە بەهیچ شێوەیەك لە ئاسودەیی بەهرەمەند نابێت ئەگەر وا دابنێت بەهۆی هەبوونی سامانێکی زۆرە و بەختەوەری بەدەست دەهێنێت، لەبەر ئەوەی یەکێك لە خاسیەتەکانی پەیاکردنی ماڵ ئەوەیە ، هەرچەندەی کۆی بکاتەوە و پێوەی ئارەزوو بکەی ئەوە هێشتا هەر هێندەی ترت ئەوێ و چاوت پێی تێر نابێت،هەروەکو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (لوكان لِابن آدم واديان،مِنْ ذَهَبٌ لأبتغي لهما ثالثا)[1] .

واتە: ئەگەر ئەوەی ئادەم دوو شێو و دۆڵی لەزێڕ هەبێت ئەو بۆسێیەمیان هەوڵ دەدات، جا لەم ڕووەوە شەیتان زەربەی خۆی ئەوە شێنێت لەبەرئەوەی فرسەتی بۆ ڕێك کەوتوە و ئەو کەسەی بە ویستی خۆی کەمەندکێشی دەکات بۆ لای ئارەزووەکانی،وە ئارەزووی هەبوونیماڵیش هەرگیس تێر بوونی نیە تەنیا ئەو کەسە نەبێت کە ژیانی خۆی لەناو قەناعەت دا بەسەر دەبات و بۆ چرکە ساتێکیش خۆی ناداتە دەست ئارەزووە بڵاوەکانی،کەسێك ئەگەر بێت و کەمێك بیرلەخۆی بکاتەوە کە بۆچی ئەوەندەی حەز بەکۆکردنەوەی داراییە ئەوکات چەند شتێکی بۆ ڕوون ئەبێتەوە ،وەکو ئەوەی ئەگەر بێت و بەخۆی بڵێت: من هەرچەندە سامانم هەبێت ئەو کاتەی ئەڕۆم تەنیا خۆم و پەرچە پەڕۆکێکم ،وەهەرچەندە خاوەنی زۆرترین خانوو بم تەنیا لەناو یەکێکیان دا ئەژیم ،

وەهەرچەندە خاوەنی ئۆتۆمبێلی زۆر بم هەر تەنیا یەکێکیان لێ ئەخورم،بەم شێوەیە باشتر لەمانای پەیاکردی سامانەکەی تێ دەگات و ئەوەندە خەفەت کە چەندەی ماوە بۆکۆکردنەوەی زیاتر ،وەلە چەندێرێك دا هاتووە دەڵێ:

---

١ ــ متفق عليه.

گۆڕەکەت ئەڵێ چی بەدەست بێنی

تەنیا پەڕۆکێك لەگەڵ خۆت دێنی

بۆیە وشیار بە گەشتەکەت کەمە

خاوەنی چەندبی ئەوەندەت خەمە.[1]

ماڵ کۆکردنەوە لەکۆتاییدا چەند بێت ئەوەندە خەفەت و ناخۆشیش لەگەڵ خۆی دێنێ بەمەرجێك ئەگەر بەحەڵاڵی بەدەستی نەهێنابێت و ئەگەر بەحەڵاڵیش بەدەستی هێنابێت لە کاری نەشیاو دا سەرفی کردبێت.

**چوارەم:** خاڵێکیتر ئەورووژێنین کە بەهرەمەند نەبوون لێی زۆربەی تاکەکان بەرەو گێژاوی خەفەت باری دەبات و وایان لێ دەکات نەزانن بەهۆی چیشەوە ئاوا نائاسودەبوون، ئەویش بەستنەوەی هیواکانت بەکەسانی ترو نەمانج دارنەبوون لەژیان، ئەو کەسەی دایمە بیری لای ئامانجەکانی بێت بەردەوام کاتەکانی لەهەوڵدان بۆگەیشتن بەو ئامانجانەی بەسەر ئەبا، کەچی ئەو کەسەی هیچ هیوایەکی نیە و لەپێناو هیچ ئامانجێکدا تێناکۆشێت، لێی پاڵ کەوتووە تەنیا پشت بەخەڵکی دەبەستێت بۆ کردنی کارەکانی ئەوە زۆربەجێ ماوە لەکاروانی بەختەوەری ، نەبونی ئامانج ئادەمیزاد والێ دەکات ژیانی لەبەرچاو زۆر تەسك بێتەوەو نەزانێت لەپێناوچی دا بەردەوامە لەژیان،بۆیە بەردەوام شوێنێکی بەتاڵ لەدڵیدا هەیەکە خەمباری بۆدێنێتە کایەوەو هەرکارێك بیەوێت ئەنجامی

---

[1] – (نوسەر) لەکتێبی ڕاستی تەمەن بەرگی دووهەم.

بدات ئەوەناگات بەئامانج لەبەرئەوەی هیچ هیوایەکی بۆخۆی تیّدا دانەناوە و وەکو بلّقی سەر ئاو وایە بۆ هەموو کاریّك پشت بەتواناکانی خۆی نابەستیّت و داوا لەخەلّکی دەکات بۆکردنی،چونکە ئەو کەسانەی بەردەوام پشت بە خەلّکی دەبەستن نابنە خاوەنی هیچ، چونکە جگە لەخودای گەورە هیچ شتیّك شایەنی ئەوەنیە پشتی پیّ ببەستی، هەروەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: (وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ...) **الطلاق(٣)**. واتە:هەرکەسیّك پشت بەخوا ببەستیّت دوای بەکارهیّنانی هۆکار،ئەوە تەنیا خوای گەورە بۆی بەسەو کاروباری بۆئاسان دەکات.هەربۆیە پشت بەستان بەخوای پەروەردگار لەگشت کاریّك،ئامانجەکەی بەراستی دلّ خۆشکەر ئەبیّتودەبیّتە مایەی سەرفرازی، ئامانجداربوون لەژیان و بەردەوام پشت بەخوا بەستان دەتکاتە خاوەنی دلّیّکی پڕ لە ئارامی بۆ بەرەنگاربوونەوە بەرەوە داهاتوویەکی پڕشنگدار.وەلەوتەیەکی جواندا هاتووە کە دەلّیّ (بۆئەوەی هەمیشە ئاسودەبی،هەرگیس هیواو هەولّەکانت بەکەس مەبەستەوە)[١].

وەلەچەند دێریّك دا دەلّیّین:

ئەرکەکانـــی خۆت بەکەس مەسپێرە

تەنیا هەر خەم سارد بەم ئیشە فێرە

ئامانجەکانت نەکەی بـــاس بکەی

لەلای ئەنانی باس و خواس بکەی

---

١ - بردناشۆ.

دوایی بەبێ شك سارد و سڕ ئەبی

بۆهەولەکانت مات و وڕ ئەبـــی

بۆ هەموو کارێك پیلانت هەبـــێ

هەر (**حسبُنااللّٰه**)وشەی زارت بێ.[1]

**پێنجەم**: لقێکی تر لەداری هۆکارەکانمان: هەستێکی ترسناکە پێویستی بە ڕامالێن و وەدەرنان هەیە لەناخی مرۆڤەکان، ئەویش خۆبەراورد کردنە بەکەسانیتر ئەوکەسانەی کە بەبیرو بۆچونی خۆت لەتۆ بەرزترن لەزۆر ڕووەوە و تۆش لەوان نزم تری ،ئەم جۆرە بەراورد کردنە زۆر نەشیاوە و ئەبێتە هۆی دروست بوونی هەستێك لەدڵ کە ئەو هەستە وەکو نەخۆشیەکی کوشندەوایە بۆ دڵ وەئارامی لەدڵ دەسێنێتەوە، هەوەکو چۆن هەبوونی ئازارێك لەجەستە خەو لە چاو دەسێنێتەوە، ئەو هەستەش حەسودیە بەیەکێك لە نەخۆشیە ترسناکەکان دەژمێردرێت، و هەم زیانی بۆ دونیا هەیە هەم بۆ دوا ڕۆژ، دەبێت ئاگاداری ئەم میکرۆبە بیت کە ڕێگە نەدەیت خۆی بکات بەجەستەی بەختەوەریت لەبەرئەوەی نەخۆشی چاوەڕوان نەکراوت بۆ دەهێنێ،هەروەکو چۆن میکرۆب لەدار دەدات و ئەی ڕزێنێت ئاواش ناخ وێران دەکات و کردەوە چاکەکانیش دا ئەماڵێت،

---

[1] - نوسەر ،لەکتێبی ڕاستی تەمەن.

بابچینە خزمەت فەرموودەیەکی پێغەمبەرمانﷺ کە فەرموویەتی: (إياكم والحَسَدْ فإنَ الحَسَدَ يَأكُلُ الْحَسَناتِ كَما تَأكُلُ النارُ الحَطَبَ)[1].واتە: ئاگەدارتان ئەکەمەوە ئاگاداری حەسودی بن چونکە حەسودی چاکەکانتان ئەسوتێنێت هەروەکو چۆن ئاگر چیلکە(وردە) دار دەسوتێنێت.بێگومان هەریەکێکیش لە ئێمە بزانێت کە بەو شێوەیە کردەوە چاکەکانی ئەسوتێت ئەوە زۆر خەم بار دەبێت و وە ئەگەر هەوڵی دا ئەو هەستە بکوژێنێتەوە لەناخی ئەو کاتە ئاسودەییەکی زۆر لە دڵی خۆی دا بەدی دەکات،سەرەڕای ئەمانەش جۆرێکی تری حەسودی هەیە پێچەوانەی ئەم هەستەی تازەباسمان کرد دڵ خۆشی لە دڵدا دەڕوێنێت، بۆیە لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (لاحَسَدَ إلا في اثنَين،رَجل آتاهُ الله القُرآن فَهو يَقوم به آناء اللَيلِ و آناءَ النَهار وَرَجل آتاهُ الله مالاً فهو ينفقه آناء الليل و آناء النَهار)[2].واتە:حەسودی بردن لەو دوانە دانیە،پیاوێك خەریکی قورئان بێت وبیخوێنێت و کاری پێبکات بەشەووبەڕۆژ،وە پیاوێك خودای گەورە ماڵی و دارایی پێ بەخشی بێت و ئەویش لەکاری خێردا سەرفی بکات بەشەو و بەڕۆژ. بەواتایەکیتر حەسودی بردن بەودووانە ڕێگە پێ دراوە ،ئەوەی خۆی شارەزا دەکات لەزانست و زانیاری و ئەوەی سامان دەبەخشێت لەپێناو خودا دا، بۆیە لەشوێنی ئەوەی خۆت سەرقاڵ بکەی بە حەسودیەك کە زەرەری بۆت هەبێت، خۆت سەرقاڵ بکە بەم حەسودیە کە وات لێ دەکات سودمەندی دونیاو دواڕۆژ بی ،لەبەرئەوەی بەم شێوەیە دەتوانی لەخاڵێکیتر بەهرەمەند بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری و لەناوبردنی دڵتەنگی.

---

١ - أخرجه أبو داود (٤٩٠٣) والبزار (٢ / ٤٣٣ ) وعبد بن حميد في ( مسنده ) (١٤٣٠ ) والبيهقي في ( الشعب ) (٥ / ٢٦٦ ).
٢ – متفق عليه عن إبن عمر.

وازهێنان لە حەسودی سودێکی زۆری هەیە لەوسودانەی کە لەبەسەرهاتێکی کورت دا هاتووە کە (اصمعی)دەڵێ:پیاوێکی دەشتەکیم بینی کەتەمەنی گەیشتبووە (١٢٠)ساڵ، منیش پێم گوت ، ئای کەتەمەنت چەندە درێژە، ئەویش گوتی:حەسودی و ئیرەییم بەکەس نەبردووەو وازم لێ هێناون بۆیە تەمەنم هەرماوە خەفەتم بەدیار خەڵکەوە نەخواردووە کە ئەوان چیان هەیە[1] .ئەبێ ئەوەش بزانین کە حەسودی بەتایبەتی لەچ کاتێك دا زەرەری هەیە یاحود نیەتی، بۆیە سەبارەت بەم بابەتە پرسیاریان لە شێخ حەسەنی بصری کرد: ئەی ابو سعید!، ئایا پیاوی باوەڕدار حەسودی بەخەڵکی دەبات؟ فەرمووی: ئایا منداڵەکانی پێغەمبەر(یعقوب)ت لەبیر چوون کاتێ حەسودیان بە (یوسف)علیه سلام، ی برایان برد ،بەڵام ئەگەر حەسودی لەدڵت خەفەتی دروست بوو ئەوا هیچ زیان و زەرەرت پێ ناگەیەنێت بەمەرجێ بەزوبان باسی نەکەیت و بەدەستیش کاری بۆ ئەنجام نەدەیت[2] .

---

١ – کتێبی (مرشد الخطیب) لاپەرە (٤٧٤) نوسینی (عبدالرحمان المصطاوي).

٢ – کتێبی (بەسەرهاتوو پەند وەرگرتن)بەرگی دووهەم لاپەرە(٢١٣) نوسینی (هارون نوح طه).

**شەشەم:** زۆرجار مرۆڤەکان داوا لەخودای گەورە دەکەن و وەڵمی دوعاکانیان نادرێتەوە و نایبینن بۆیە دڵتەنگ ئەبن بەخۆیان دەڵێن:باشە بۆچی وەڵامی دوعاکانمان نادرێتەوە،بەم شێوەیە جۆرە قەلەقیەك بەسەر دەرونی خۆیان دا دەهێنن و وا دادەنێن خودای گەورە داواکاریەکانیان قبوڵ ناکات، هەرکەسێك بەم پێوەرە خۆی بکێشێت توشی هەڵەیەکی زۆر ئاشکرابووە، بۆئەوەی باشتر لەهۆکاری وەڵم نەدانەوەی دوعاکانمان حاڵی بابچینە خزمەت چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کەتێیدا فەزلی دوعاو نەکردن بەهۆی بێ ئومێد بوون لە قبوڵ نەبوونی دەخەینە ڕوو، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت:( **وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾**)غافر. واتە: پێغەمبەرمان ﷺ فەرمووی پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لەمن بکەن و لەمن بپاڕێنەوە، منیش وەڵمتان دەدەمەوە،بێگومان ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن لەپەرستنم بەتەنیا، ئەوە بێگومان بەسەر شۆڕی و بچوکی دەچنەدۆزەخەوە.

بۆیە ئەلێرە دا شتێکی ترمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە ئەویش پێویستە ئەوە بزانین کە بێ ئومێد بوون لەدوعاکردن واز هێنان لێی زۆر کارێکی نەشیاوە، لەبەرئەوەی وەڵامت وەرنەگرتووە پشتی تێ بکەیت و لەفیکری خۆت والێك بدەیتەوە کە خودای پەروەردگار تۆی فەرامۆش کردووە، بەڵکو دەبێت ئەوەت لە یاد نەچێت کە خودای پەروەردگار هەر ناخۆشی و خەم و پەژارەیەکی بۆت ڕەوانە کردووە بۆئەوەیە کە دەمێکە گوێ بیستی پاڕانەوەکانت نەبووە و دەیەوێت داوای لێ بکەیت تا لەو ناخۆشیە دەرت بهێنێت، وە پێغەمبەرمان ﷺدەفەرمووێ(مَنْ لَمْ يَسأَلِ اللهَ يَغْضِبَ عَليه)[1].واتە: هەرکەسێك لەخودای گەورە نەپاڕێتەوەو داوای لێنەکات لێی توڕەدەبێت،

---

١ ـ حسنه الألباني ( انظر : صحيح سنن الترمذي برقم (٢٦٨٦).

پاڕانەوەی بەندە لەپەروەردگاری خۆی جوانترین داواکردن و عیبادەتە کە ئەنجامی بدات،بۆیە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرمان ﷺدەفەرمووێ: (إن دُعاءُ هوَ الْعِبادَةِ)[1].واتە: دوعاکردن خۆی لەخۆیدا عیبادەتەو یادکردنەوەی پەروەردگارە،

هەربۆیە بەڕاستی زۆر پێویستە ئاگەداری دوعاکانت بیت و دەستیان پێوە بگری بەصبرەودو پەلەی لێ نەکەی لەوەڵم دانەوە، لەبەرئەوەی وەڵام دانەوە جاوازی هەیە لەگەڵ قبولّ بوون ، هەر لەم بارەیەوە مامۆستا(سعیدی نورسی)خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێ:( زۆر جار ئێمە لە خودای گەورە دەپاڕێینەوە، بەڵام پاڕانەوەکانمان گیرا نابن،هەرچەندە ئەم ئایەتەی کەخوای گەورە فەرموویەتی(وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ)گشتیەو بەڕوونی وئاشکرا دەفەرمووێ هەموو پاڕانەوەیەك گیرایە؟ وەڵام: گیرابوونی نزاو پاڕانەوە (إستجابه الدعاه) جیایە لە قبولّ بوونی!چونکە هەموو پاڕانەوەیەك گیرا دەبێت،بەڵام قبولّ کردنی پاڕانەوەو هاتنەدی داواکاریەکە بەستراوە بە دانایی و حەکیمی خواوەند خۆیەوە، بۆ ئەمە نموونەیەك دەهێنینەوە: وادابنێ منداڵێکی نەخۆش دەبرێتە لای پزیشك، منالّەکە هاوار دەکات و دەڵێت:دکتۆر! سەیرم بکە بزانە چیمە، پزیشکەکەش دەڵێت :بەسەرچاو،منالّەکەش دەڵێت: ئەو دەرمانەم بدەرێ بۆم باشە، لێرەدا ئەو پزیشکە بەپێی دانایی خۆی و بەرژەوەندی منالّە نەخۆشەکە، هەمان دەرمان،یان یەکێکی لەوە باشتری دەداتێ، یاخود هیچ دەرمانێکی بۆ دەست نیشان ناکات،چونکە لەوانەیە زەرەری بۆی هەبێت، بەهەمان شێوەش پەروەردگار داواکان لە بەندەکانی قبولّ دەکات(ولله المثل الأعلی)[2].ئێستا بۆت ڕوون بویەوە کە دوعاکردن چەندە گرینگە ئەگەر بێت و صبری

١ - رواه الأربعة وصححه الترمذي.

٢ – رسائل النور ،بديع الزمان (سعد النورسي).

لەسەر بگری و بیّ هیوانەبی لیّی، بیّ هیوا بونت لە دوعاکردن دلّتەنگی دەکات بە تاجی سەرت و خەتمی نیّوچاوانت ،بۆیە دەستی پیّوەبگرە.

**حەوتەم:** هۆکاریّکی تر کەوا لە بالّندەی خەم دەکات لەسەر شانت بنیشیّتەوە، ئەویش: غەیبەت کردن و باسکردنی نەقسیەکانی کەسانی ترە لەلای خەلّکی ،لەوانەیە پرسیاریّك لەمیّشکمان دروست بیّت کە ئایابۆچی غەیبەت کردن سەرچاوەیەکە بۆ دروست بوونی دلّتەنگی؟!، هۆیەکەی بۆئەوە دەگەریّتەوە کەکەسی غەیبەت کەر باسی نەقسیەکی برا موسولّمانەکەی خۆی دەکات،خۆی لەبیرچووەتەوە کەخاودنی چ هەلّەیەکە،وە دوای ئەوەی باسی کەم و کورتیەکانی کرد بەردەوام لەقەلەقی دادەبیّت نەکا کەسیّکیتر قسەکانی بۆ ئەو کەسە بگیّریّتەوە کە غەیبەتی کردووە،ئەوە لەلایەك لەلایەکیتر دەکەویّتە بەر چەندین هەرەشەی خودا و پیّغەمبەر کە لەسەر ئەو جۆرە سیفەتە فەرموویانە، بۆیە لەزۆر لاوە زەردرمەند دەبیّت و کەسی زدرەرمەندیش هەمیشە خەفەتبار و ناسەقامگیرە، باساتیّك رابیّنین لە یەکیّك لەفەرموودەکانی خودای پەروەردگار کەسەبارەت بە قسە هیّنان و بردن و باسکردنی عەیب و عاری خەلّکی و گومانی خراپ بردن بەیەکتری دەفەرموویّت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾الحجرات. واتە: ئەی ئەوکەسانەی کە باوەرتان هیّناوە! خۆتان لەزۆریّك لەگومان بردن بەیەکتر دووربگرن چونکە هەندیّك لەو گومانانە مایەی دوچاربونتانە لای خودا،وە بەدوای عەیب و عارو کەم و کوری یەکتردا مەگەریّن و چاوەچاو مەکەن، لەپاش ملە ناوی یەکتر خراپ مەکەن،ئایا کەستان پیّی خۆشە گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات،دیارەئەمە ئەو پەری ناشرین کردنی ئەو کارەیە،تامرۆڤەکان سلّی لیّبکەنەوەو نەیکەن، وەئاشکرایە کە

ئەوەتان زۆر پێ ناخۆشە و ،حەزی لێ ناکەن و نای خۆن،وەلەخوا پترسن وسنورەکانی مەشکێنن،بێ گومان خوا زۆرلێبووردەیە بۆ هەرکەسێك پەشیمان بێتەوە لەوکارە ناشرینەی کردویەتی زۆریش میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆی.

جا بەڕاستی ئەمە زۆر ترسناکە بۆ کەسێك خۆی لێ نەپاراستبێت ئالەم سیفەتانە، مرۆڤ چەندە لە دائیرەی ئیمانی خۆی توندبگرێت زیاتر دەرونی لەپاش ماوەکانی گوناھ و تاوان خاڵی دەبێت،وەهەروەها لەفەرموودەیەکیتردا کە ئەبوهورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە کە پرسیاریان لە پێغەمبەرمانﷺ کرد وتیان غەیبەت چیە؟

ئەویش فەرمووی: (ذكرك أخاك بما يكره).واتە: ناوهێنانی براکەت بەهەر شێوەیەك پێی ناخۆش بێت،کابرا وتی: باشە ئەگەر ئەوەی من پێی دەڵێم وابوو؟ هەربە غەیبەت دادەنرێ؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ( إن كان فيه ما تقول، فقد اغتبته، وإن لم يكن فيه فقد بهته)[1]. واتە:بەڵێ ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت وابوو ئەوە غەیبەتت کردووە،ئەگەر وانە بوو،ئەوە بوختانت بۆی کردووە.بۆیە دەڵێین لەپاش ئەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە چ شتێك هەیە تا دوات بجات لەواز هێنان لەغەیبەت و گومانی نەشیاو و شت گەلێك کە بەرهەمەکانیان تەنها سەر ئێشەو دەردەسەریە بۆ خاوەنەکەی.وە هەر لەمڕ بابەتەکەمان لە شوێنێکیتر دا هاتووە کە خودای گەورە نیگای کرد بۆ پێغەمبەر (موسا)عليه سلام، پێی فەرموو: ئەی موسا ئایا حەزدەکەی یارمەتیت بدەم بۆئەوەی بەسەر دوژمنت دا زاڵ بیت؟ پێغەمبەر موسا فەرمووی: بەچی؟! خودای گەورە فەرمووی: بەوەی باسکردنی خەڵك بۆیان بگەڕێنیتەوە، واتا داوای گەردن ئازادیان لێ بکە، هەرکەسێ بمرێ تەوبەی

١ - رواه مسلم برقم حديث(٢٥٨٩)، و أبوداود جلدی ٥ لاپەڕە (١٩١).

کردبێ لەغەیبەت و دوو زمانی، ئەوا لەدوای هەموو کەس دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ[1]؛ جابۆیە بالەوە خافڵ نەبین کە کەسانی غەیبەت کار چ کۆتاییەك چاوەڕوانیان دەکات، بەمەرجێك تەوبەی لێ نەکردبێت،ئەم کارە نەشیاوە چەندە لەسەر زمان ئاسانەو چەندەش ئەنجامەکەی خەفەت ئامێزە، ئەوەی خۆی لەداوی غەیبەت ڕزگار کردبێ ئەوە زۆر بەختەوەری لێیەوە نزیکە ئەتوانێ هەستی پێ بکات،هۆکەشی بۆئەوە دەگڕێتەوەکە خۆی لەم هەموو هەڕەشەیە پاراستووە، خودای گەورەش تەوفیقی هەموو لایەکمان بدات.

وەلەم لێرەش دا دەڵێین:

قسەیەکی خراپ کرا لەمەجلیس

بەدوای دامەچۆ کەلەوانت بیست

غەیبەت ئاگردان بۆتۆ خۆش دەکا

گوریسی چاکەت مەکەوە بە ڕیس[2].

---

١ – أحياء علوم الدين (٢٢٣/٣)، بحر دموع ابن الجوزي.

٢ – نوسەر ، لەکتێبی (ڕاستی تەمەن )بەرگی یەکەم.

**هەشتەم:** هەرچەندە لەدەریای خەم دا مەلەبکەین وبمانەوێت بگەین بەکەناری بەختەوەری ئەوە هێشتا هۆکاری تر هەن کەرێگرن لەبەردەم گەیشتنمان بەو کەنارە، بۆیە یەکێکێتر لەو هۆکارانەی کە زیاتر ماندوومان دەکەن لەسەوڵ لێدان بۆ تێپەڕبوون بەناو ئەودەریایە بێ بنە، ئەوەیە کە مرۆڤ لەزۆربەی حاڵەتەکانی ژیانی دا، لەکاتی گفتوگۆکردن لەبیری دەچێتەوە سنوری قسەکانی لەچ هێلێکی سورەوە نزیکە، ئاگەداری ئەو قسانە نیە کە لە دەمیەوە یەتەدەرەوەو بەباشی کۆنترۆڵیان بکات، قسەکردن بەبێ بیرکردنەوە، یاخود بڕیار دان بەبێ بیرکردنەوە کارێکی زۆر هەڵەیە، مرۆڤ گەورەترین و زۆرترین کێشەی لەرێگەی زمانیەوە توش دەبێت، زمان پارچە گۆشتێکە وئەندامێکی لەشە بەهەموو ئەندامەکانی تری مرۆڤ ئەوەندەی زمان ،مرۆڤ بەرەو پەشیمانی و خەفەتباری نابەن، ئەگەر بێتوو مرۆڤ بتوانێت سوکانی زمانی خۆی بەتەواوی لەژێر ئیدارەو ڕکێفی خۆی بێت ئەوە بەڕاستی زۆرترین ڕێگەی بڕیوە بۆ گەیشتن بەبەختەوەری، وەهەر قسەیەك كە لەدەم دێتە دەرەوە ئەگەر خاوەنەکەی بەباشی کوڵاندبێتی ئەوا سودی بۆگوێگرەکانی دەبێت،ئەگەر ناوەکو لەغوەیەك دەچێتە ناو هەواو ون دەبێت،هەروەکو لەوتەیەکی زێڕین دا هاتووە کە ئیمامی (علی) دەفەرمووێ(سِرُكَ أسيرك فأن تكلَمْت به صرْت أسيره)[1]. واتە:( قسە پێش ئەوەی بی کەی تۆ حاکمی ئەوی و ئەو ئەسیری تۆیە ،بەڵام کە کردت تۆ دەبیتە ئەسیری ئەو)،واتە: پێش ئەوەی قسە بکەی تۆ بڕیار لەسەر قسەکەت دەدەی کە بەچ شێوازێك بێت و بکرێت، بەڵام دوای وتن ئەو بڕیار لەسەر تۆ دەدا کەچ قسەیەکت کردوە وە ئەو قسەیەش تەعبیر لە کەسایەتیت دەکات.

---

١ – موسوعة الأخلاق الأسلامية،نوسینی (سعید یوسف محمد ابو عزیز)بەرگی دووهەم لاپەرە (١٦٩)

وە زمان لەلایەکی ترەوە وەکو نەخشەیەك وایە کە ڕێگای دوا ڕۆژی مرۆڤی پێوە بەندە، لەبەرئەوەی هەرقسەیەك پێشکردنی بیرکردنەوەی لەگەڵ دانەبێت،ئاکامێکی باشی نابێت هەرلەم باسەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بەخۆمان ئاشنابکەین کەچەندە بەکورتی و بەپوختی باسی لەجۆری قسەو شێوازی دەربڕینەکەی ڕوونکردۆتەوە بۆمان دەفەرمووێ:(مَنْ كانَ يُؤمِنُ باللهِ والَيومِ الأخِرِ فَلْيَقُلْ خَيراً أو لِيَصْمُتْ)[1].واتە: (هەرکەسێك باوەڕی بەخواوبەڕۆژی دوایی هەیە باقسەیەکی چاك بکات یاخود بابێدەنگ بێت).لەبەرئەوەی هەموو قسەیەکی چاك پێویستی بەبیرکرنەوە هەیە پێش وتنی ئەگەر بیرکردنەوەکە بۆ چرکەساتێکیش بێت،بۆیە ئەلێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئایا چ جۆرە قسەیەك پێی دەوترێت چاك،وە لەلای پەروەردگار ببێتە مایەی پاداشت بۆت و لەدونیاش دا لەپەشیمانی بەدووربی پاش وتنی.بەوقسەیە دەوترێت چاك:کەیادوزیکری پەروەردگاری تێدابێت،یاخود ئامۆژگاریەکی ڕێگەی چاك یان قسەیەك بێت دوور بێت لەغەیبەت و گاڵتەجاڕی کردن بەکەسانی تر،بەم شێوەیە کەسی قسەکەر هەرگیس دوای قسەکردنەکەی پەشیمان نابێتەوە لێی و توشی ئەو دادگاییە نابێت کە نەفسی پێی دەکات لەو کاتەی کە بەخۆی دەڵێ بۆوات کرد نەدەبوو ئەو قسەیە بکەی، پەلەکردن لەبڕیار دان تابڵێی کارێکی نەشیاو و نەخوازراوە ، هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چونکە پەلەی تیایە، لای هەمووشمان مەعلومە سەرئەنجامی کاری پەلە پەشیمانیە،لەلایەکی تریش زمان مرۆڤ بەهیلاکەت دەبات، کە سەرئەنجامەکەی بیرنەکردەوە بووە پێش دەربڕین، هەروەکو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: (إذا أصْبَحَ ابنُ آدَم فَإن الأَعْضَاءَ كلَها تُكفَرُ اللِسَانَ، تَقول :اتَقِ اللهَ فينَا فإنَما نَحْنُ بِك،فإن اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا وإنْ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا)[2].واتە: بەیانی کە

١ – متفق عليه.

٢ – رواه الترمذي.لەکتێبی(رياض الصالحين)نوسینی (يحيي بن شرف النووي الشافعي) .

دەبێتەوە هەموو ئەندامەکانی لەش داوا لەزمان دەکەن کە قسەی هەڵەنەکات وە پێی دەڵێن:لەخوا بترسە ئەگەر تۆ ڕاست بی ئێمەش ڕاست دەبین بەڵام ئەگەر خراپ بیت ئەوا ئێمەش خراپ ئەبین. لەبەرئەوەی بەهۆی زمانەوە مرۆڤ دووچاری ئاگر دەبێتەوە وئەندامەکانی تریش بەهۆی ئەوەوە توشی سزای پەروەردگار دەبن و ئەچنە ڕیزی خەسارەت مەندان، لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا خودای پەروەردگار ئاگەدارمان دەکاتەوە کە ئاگامان لەو وتانەبێت کە بەهەوەس لەدەممان نەیەتەدەرەوە،تا بەدووربین لەخەسارەت مەندی، کە دەفەرموویت: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ۝ ١٨﴾ سورة ق)واتە: فریشتەی چاودێریمان داناوە کەهەرقسەیەك لەدەم بێتەدەرەوە ئەوەتۆماری دەکەن بۆیە چەند لەزمان بیّ ئاگابیت و بەرِەڵای بکەی وبەبیّ بیرکردنەوە بەکاری بهێنی،ئەوەندە دووچاری دڵتەنگی دەبیتەوە، وەلەچەند دێریکی ڕێك و پێك دا هاتووە کە دەڵیّ:

زمانت ڕابێنە لەسەر قسەی حەق

بـەئەدەبە نـەوەك بەشێوازی ڕەق

ئەو پارچەگۆشتەی لەناو دەم دایە

کلیلـــی دەرگـای خێرو بـــەڵایــە

هەروەك چۆن دەرگای خێردەکاتەوە

ســەری زۆر بــەڵاش هەڵ ئەداتەوە. [1]

---

١ – پیرەمێرد.

**نۆیەم**: بەهەدەردانی یەکێکی تر لەهەوڵەکانت بۆ گەیشتن بەبەختەوەری ، هۆکاریکە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت لەرێگەی چونت بۆ بەختەوەری دوورت دەکاتەوە، ئەویش حەزکردنتە بەشتانێك کە پێویستت پێی نیە، مرۆڤ تائەو کاتە مێشکی ئاسودەیە کە خاوەنی چەند شتێك نیە ،بەزۆر بوونی ئەوشتانە کەدەبێتە خاوەنی ،پەیتاپەتا مێشکی سەرقاڵ دەبێت و وردە وردە خۆی لەبیر دەچێتەوە کە لەکام کۆڵانی پێداویستیەکانی خۆی ون کردووە، داواکردنی شتی زیاد کە پێویستت پێی نابێت و سودی نیە بۆت ،بەرەو ئاراستەیەکی ترت دەبات، باگوێ لە پێشەوا (إبن القيم الجوزي) بگرین خوا لێی ڕازی بێت کەسەبارەت بەو شتانەی کە مرۆڤ پێویستی پێ نیە چی دەفەرمووێ، بۆیە دەفەرمووێ: (١٠)شت هەیە هیچ سودێکی بۆ مرۆڤ نیە وە زۆر بوونیشی جگە لەکێشە هیچی تری نابێت بۆ خاوەنەکەی کە ئەمانەن:

١- زانستێك کە کاری پێنەکرێت.

٢- کاروکردەوەیەك کە ئیخلاسی تیانەبێت.

٣- سەروەت و سامانێك لێی نەبەخشرێت،خاوەنەکەی نەلەدونیا لێی بەهرەمەند ئەبێت، نەهیچیشی پێش دەخات بۆ قیامەت.

٤- دلێك چۆڵبێت لەخۆشویستنی خواوتامەزرۆی گەیشتن بەخوا نەبێت وهۆگرنەبێت پێی

٥- لاشەیەك کەبەندایەتی خوا نەکان.

٦- خۆشەویستی خوا کەوای لێنەکات گوێڕایەلی بکات و ڕەزامەندی بەدەست بهێنێت.

٧- کاتێك ئەگەر لە سودوچاکە و نزیك بوونەوە لەخودا بەکارنەهێنرێن.

٨- فیکروبیرێك کەلە شتێك دەگەڕێت کە سودی پێناگەیەنێت.

٩-کارکردن بۆشتێك کەمەبەستت ڕەزامەندی خوانەبێت،چونکە چاکسازی دونیاشت نا بێت.

١٠- ترست لەکەسێك بێت و ئومێدت بەکەسێك بێت کە بۆخۆی نێو چەوانی بەدەست خوایە،دیلی بەردەستی خوایە،کەزەرەروقازانج ومردن وژیان و زیندوبونەوەی خۆی بەدەست نیە.

*ئەمانە هەر هەموو شتی بیٰ سود و بێکەڵکن ئەگەر خاوەنەکەی هەرچەند داوا بکات هیچی بۆی نابێت،وەگەورەترین زەرەریش کەمرۆڤ بیکات دوانن،وە بنچینەی هەموو زەرەرێکن: ١- إضاعة القلب:دڵ بەفیڕۆدان. ٢- إضاعة الوقت:کات بەفیڕۆدان.

دڵ بەفیڕۆدان ئەوەیە دنیا بەسەر دوا ڕۆژدا هەڵبژێریت، کات بە فیڕۆدانیش دڵ پەیوەست بوون و ئومێد بوونە بەدونیا،کە ئەم هەستەش زیاتروزیاتر وات لیٰ دەکات داوای شتی زیاتر بکەیت لەدونیا کە سودیان نیە بۆت،چونکە هەموو خراپەیەك لەم دوانە کۆبۆتەوە شوێنکەوتنی دونیاو ئارەزوات،وە ئومێدی نەبڕاوە بەدونیا[١].

بۆیە چەندە کێشەیە کەسێك بەردەوام گوریسی تەمەنی بە حەزوهیواکانی ببەستێتەوە، چ حەزوهیوایەك!؟ ئەوانەی کە هیچ سودێکی پیٰ ناگەیەنن،شتێك کە پێویستت پیٰ نیە و بەردەوام داوای دەکەی و مەیلت بۆی هەیە،ئەوە لەچەرمەسەری زیاتر هیچی بەدواوەنیە تالەگەڵ خۆی بۆت بهێنێت.

١ – (إبن القيم الجوزي) لەکتێبی (الفوائد)لاپەڕە(٢٢١).

**دەیەم:** ڕەشەبایەکی زۆر توندو چڕوپڕ هەیە کە ئەگەر هەڵ بکات لەناخی تاکەکان ئەوە ددرون بەرەوسەحرایەکی بێ سەروشوێن دەبات،ئەم ڕەشەبایەش،هەڵگرتنی یاخود دروست بوونی ڕق و کینەیە لەدڵ بەرامبەر بەکەسانی تر،هەستی ڕق و کینە وەکو شەوەزەنگ وایە کەبەسەر دڵی مرۆڤ دا دێت و چاوی دڵ کوێر دەکات بۆ بینینی سۆز و موحیببەت لە ڕوخساری بەرامبەرەکەیدا، بۆنمونە کاتێك کە هەست بەدڵتەنگیەك دەکەیت،بۆ دەست نیشانکردنی ئەودڵتەنگیە پێویستەکەمێك بیربکەیتەوە،زۆرجاری واهەیە سەرئەنجامەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆشیت بەکەسێك دانەهاتووە یاخود هەر لەگەڵبینینی ئەو کەسە نەفەست تەنگ ئەبێت و وا دائەنێی کە هیچ نەبووە ، لەبەرئەوەی تۆ کەلەناخت دا ڕقێکت هەڵگرتووە لەناو مەنجەڵی توڕەییدا، هەرلەگەڵ بینینی ئەو کەسە یەکسەر سەیری ئەو مەنجەڵە هەڵ ئەدرێتەوە ڕەنگە هەرهەستیشی پێنەکەیت،لەسەر بیرلێکردنەوە و خواردنەوەی ئەو ڕق و کینەیەی لەبەرامبەر ئەو کەسەدا بۆت دروست بووە،ئەبینیت هەر لە خۆتەوە قەڵس و مۆنی باڵدەکێشێ بەسەر ڕوخساتدا هاتووە چونکە ئەمە بەرهەمی ڕق و کینەیە،بەچاندنی لەناو دڵت،پاش ئەوەی دەڕوێت دڕکەکەی ئازارت پێ دەگەیەنێت، بۆیە هەوڵ بە پێش ئەوەی تۆیەکە بڕوێت هەوڵبدەیت پوچەڵی بکەیتەوە تا لەزیانی ئەم دڕکە خۆنەویستە بەدووربیت،وەکو لەوتەیەکی ناوازەدا هاتووە کە دەڵێت: (توڕەبوون وەکو ئەوە وایە تۆ زەهر بخۆیت و چاوەڕوان بیت بەرامبەرەکەت بمرێت).

**یانزەهەم:** گەڵایەکی تر لەگەڵاکانی درەختی هۆکارەکانی دڵتەنگی و ناارامی ڕێگە دانە بەشەیتان کەبتوانێت دزەبکاتە ناودڵتەوە، زۆر پێویستە لەوە بێ خەبەرنەبیت کە شەیتان لەهەموو کاتێکدا لەکەمین دایە بۆت،بۆیە بەڕاستی شارەزایی تۆ ئەلێرەدا بەدیار دەکەوێت کە بەچ شێوازێك خۆت لە داوی ئەم دوژمنە سەرسەختە لابدەی،پێش ئەوەی

بگات بەتۆ لەم خاڵانە ئاگەداربە کە شەیتان (سێ) ڕێگەی سەرەکی هەیە لێیەوە دێت تا هەڵت بخەڵەتێنێ،ئەوانیش ئەمانەن:

١- زیادە مەسرەفی ، کە مرۆڤ زیاد لەپێویستی خۆی کارێك بکات لەبەر ئەوەی شەیتان لەم ڕێگەیەوە دەتوانێت بەئاسانی بگات بەدڵی مرۆڤ،چونکە مرۆڤ دوای هەرزیادەڕەویەك لەکارەکانی سەرئەنجام بەرەو کێشەو نارەحەتیدەڕوات،بۆنمونە: زیادە مەسرەفی لەزۆر شت کڕین یاخود زۆر خواردن یان زۆر نەخەوتن یان زۆربیرکردنەوە لەوەی کە خۆی بەکەسێکی غەریب بێتە پیش چاو لەبەرئەوەی کەسێکی نەدۆزیوەتەوە گوێ بۆ قسەکانی بگرێت و چەندان شتی تر ،بۆیە ئەگەر مرۆڤ ئەم ڕێگایەی داخست ئەوکاتە دڵنیا دەبێت لەنەهاتنی شەیتان بۆ دڵی.

٢- بێ ئاگایی لەکاتی بێ کاریدا،چونکە ئەگەر مرۆڤ یادوزیکری خوای پەروەردگار بکات وەکو ئەوەوایە لەناو قەڵای توندوقایم دابێت،وشەیتان ناتوانێت دزەبکاتە ناو ئەم قەڵایە، بەڵام هەرکاتێك بێ ئاگابوو ئەوە دەرگای قەڵاکە دەکرێتەوەو دوژمن دێنە ژورەوە، ئەوکاتەش دەرکردن و شەڕکردن لەگەڕیان زۆر ئەستەمە.

٣- خۆهەڵقورتان و تەکلیفکردن لەو شتانەی کە پەیوەندی بەتۆوەنیە،بۆنمونە دووکەس بەشەڕ دێن تۆنازانی شەڕەکەیان لەسەر چیە،بەبێ داواکردن لێت دەچی بۆناوبژیان و جاری وا هەیە تۆش دەکەویتە ناوکێشەکەوە و توشی چەرمەسەری دەبێت،بۆیە بەم ڕێگانە شەیتان بەتۆ دەگات و توشی نائارامیت دەکات ، لەبەرئەوە هەڵسەو بەئیرادەوە ڕێگەی پێ بگرە لەهاتنی.

**دوانزەهەم:** هەرچەندە هەنگاو هەڵبگرین لەڕێگەی هۆکارەکان ئەو هێشتا ڕێگەکەمان تەواونەبووەوماویەتی،هۆیەکیتر بۆهەبوونی نائارامی ودڵتەنگی،خۆبەدوورگرتنە لە مەجلیسی زیکر و پیاوصاڵحان و خۆنزیك کردنەوەیە لە مەجلیسی نادروست،وەمرۆڤی بڕوادار هەمیشە دەرونی ئارامە و دڵی پاك وبیرتیژو گەش بینە وەچاکە خوازو دڵنیایە، ئەمەش هۆکارەکانی بەختەوەری ئەم دونیایە،کەپەیوەندی هەمیشەیی بەخواوە هەیە،و ساتێکیش لێی بێ ئاگانابێت،بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت: (إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا، قَالُوا : وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ ؟ قَالَ : حِلَقُ الذِّكْرِ )[1].

واتە: ئەگەر گەیشتن بە باخچەکانی بەهەشت بەشی خۆتان بەرن،وتیان:ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کامە باخچەکانی بەهەشتە؟ فەرمووی:کۆڕەکانی یادی خودایە.

کەواتە بزانە خوێنەری ئازیز کۆڕی زیکرو یادکردنەوە چەندە لەلای خوداخۆشەویستەکە بەوشێوەیە پێغەمبەرمان ﷺ وەسفی کردووە ،ئایا بەنزیك کەوتنەوە لەو کۆڕە لەچەندین شت نزیك ئەبیتەوە کە تێیدا دەتوانی هەست بەئارامی دەرون بکەیت،وەهەروەها کاتێك لەپێغەمبەرمان ﷺ دەپرسن کەبۆچی هەمیشە بەردەوام دەبیت لە ڕۆژوگرتن و نان و ئاو نەخواردن،ئەویش فەرمووی(إني لست كهيئتكم، إني اظل عند ربي يعطمني و يسقني)[2] . واتە: من وەك ئێوە نیم، من لای خوای خۆم دەمێنمەوە ،ئەو خواردن و خواردنەوەم پێ دەبەخشێت.

لێرەدا پێغەمبەرمان ﷺ مەبەستی ئەوەیە مانەوەی لەیاد و زیکری خودای خۆی برسێتی و تێنوێتی ناهێڵێت،و ئەم کارە تەنها تایبەتە بەپێغەمبەری خوا ﷺ،وەك خۆی

---

١ – ئەم فەرموودەیە(ضعيف الأسناد)ە،رواه (الترمذي) في صحيح برقم (٣٥٠٧)،و احمد (١٥٠/٣)وەبڕوانە(السلسلة الضعيفة)ي الشيخ البانى(١١٥٠).

٢ – رواه البخاري.

فەرمووی بۆ کەسی ترنیە جابزانە تاوەکو ئێستا بەلای چەندین کۆڕو مەجلیسی زیکردا ڕۆیشتویت وخۆت لیّ غافلّ کردووە وەکو بلێی هەرنەت بینیبیّ، بەشداربوونت لێی،نزیك بوونەوەتە لەبەختەوەری و دوورکەوتنەوەتە لەومەجلیسانەی کە دلّ تێیدادەبورێتەوە لەبەر بۆن و بەرامی قسەی لەهولەعب و لغوە.

**سیانزەهەم:** دوا پەلّەهەوری ڕەش لەپەلّەهەورەکانی ئاسمانی خەم و بێزاری، کە باران بە لێزمە دەبارێنیتە سەرت و جلی بەختەوەریت تەڕدەکەن وجاری واش هەیە ڕەنگە نەخۆش بکەوی، ئەویش هاوەلّی کردن و هەبوونی هاورێی سەر بەکێشەیە،مرۆڤ دەبێت بەوردی خۆی هەلّبسەنگێنێت کە ئایا دەبێت چ کەسێك بکات بەهاورێی وبیکات بەسەر پشکی بریارو هەولّەکانی، لەبەرئەوەی هاورێ دەتوانیّ زۆر بەئاسانی بت ڕوخێنێت و بەئاسانیش بونیادت بنیّ،بۆیە هاورێیەتی کردنی کەسانی سەربەکێشە زۆر جارمایەی لیّ کەوتنەوەی نا ئاسودەیی ودلّتەنگیە،توش بونتە بەسەر ئێشەو قەلەقی،دەبێت زۆر بەچاکی بزانی کیّ دەکەیت بە یاوەرو هاودەمی خۆت، کەسێك دەکەیت بەهاورێت کە هەر لەگەلّی بیت بۆ چەند ساتێك کێشەت بۆ دروست بکات یاخود کەسێك دەکەیت بەهاورێت کە هەر لەگەلّی بینینی دا هەرچی خەم و پەژارەهەیە لەلات بڕواو نەمێنیّ.

وە بەپیغەمبەرمان ﷺدەفەرمووێ: (المَرءُ علي دينِ خَليه فَلْيَنْظُر أحَدَكُمْ مَنْ يُخالل)[1].

واتە:مرۆڤ لەسەر ڕێچکەی هاورێیەکەیەتی، جا هەریەکەتان بابیر بکاتەوە و بزانێت کیّ دەکاتە هاورێی خۆی.لەم فەرموودە پیرۆزەدا ئەوەمان بۆڕوون ئەبێتەوە کەمرۆڤ بۆ ناسینی خۆی پێویستە سەیری هاورێکەی خۆی بکات کە چۆنە، لەبەر ئەوە دوو کەس بەیەکەوە کۆنابنەوەو لەیەك ناگەن ئەگەر سروشتیان(تبیعتیان)وەکویەك نەبێت یاخود لەیەکەوە نزیك نەبێت،کەزانیت هاورێکەت باش نیە وڕەفتاری نەشیاو ئەنجام

---

١ – متفق عليه.

ئەدات،دەبێت دووبارە بەخۆت دابچیتەوە نەوەکو ئەو سیفەتە لەتۆشدا هەبوو بێت و هەستت پێ نەکردبێت، ئەگەر لەتۆدا نەبوو دەبێت هەوڵی گۆڕینی ئەو کەسە بدەیت بۆ باشترکردنی ئەگەر نادەبێت هەوڵی گۆڕینی ئەو هاوڕێیەت بەکەسێکی تر بدەیت، تاپێش ئەوەی توشی سەرئێشەی کێشەو گرفتەکان ببی وبگرە پەشیمانی ئەم دونیاو ئەو دونیات ببی،چونکە خودای پەروەردگار باسی بابەتێکی گرینگمان بۆ دەکات وەکو پەندوەرگرتن پێش ئەوەی پێی بگەین خۆمانی لێ بپارێزین، وە دەفەرموویێ: (الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴿٦٧﴾الزخرف).واتە:لەڕۆژی دوایی گشت یاران بەدەر لە پارێزکاران دەبنە دژی یەك،ئەوانەی لەپێناو خودا یەکیان خۆشویستوە زۆر دڵ خۆش و ئاسودەن، بەڵام ئەوانەی تەنیا لەپێناو شتێکی دونیایی دا یەکیان ویستووەو بونەتە لەڕێ لادەری یەکتر و هۆی کردنی تاوان بەیەکتر لەو ڕۆژەدا دەبنە دوژمنی یەکتر، بۆیە دەبێت زۆر ئاگاداری ئەو خاڵە بین کە وامان لێنەیەت بەهۆی هاوڕێی خراپ لەدوارۆژدا لەوکەسانە بین کە دەڵێن (يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا﴿٢٨﴾ الفرقان).واتە: ئەی هاوار بۆخۆم خۆزگە فلانە کەسم نەکردبا بەدۆستی خۆم،کەوای لێم کرد دوا ڕۆژم لەبیرکەم.

# چارەسەرەکان

لەپاش ئەوەی ئاماژەمان بەچەندین خاڵی گرینگ و هەستیار کرد لەوهۆکارانەی وامان لێ دەکەن نەتوانین تارادەیەك لە کێشەو گرفتەکانمان دوور بکەوینەوە و لەئاسودەییدا خۆری بەختەوەری دەمەو ئێوارانی دەرونمان ئاواکەین، هەربۆ ئەو مەبەستەمان چەندین چارەسەرمان ئامادەکردووە کەدەتوانین بەشێوەیەکی بەرچاو بەکاریان بهێنین بۆ نزیك بوونەوە و بەدەست هێنانی ئارامی دەرون و دەرباز بوون لەدڵ توندی و خەفەت خواردن، جا بۆیە بەیارمەتی خودای پەروەردگار پەردەیان لەسەر هەڵدەماڵین،بەسود وەرگرتن لە ئایەتە پیرۆزەکانی پەروەردگارو فەرموودە بەرزەکانی پێغەمبەرمانﷺ و لەگەڵ چەندین بابەتی تردا،وەبۆ زیاتر تێگەیشتن لەو خاڵانەی کەباسیان دەکەین پێویستە لەکاتی خوێندنەوەی هەرچارەسەرێك بەراوردی بکەین بەیەکێك لەوهۆکارانەی کەلەپێشترا باسمان لێوەکرد، لەبەر ئەوەی بەم جۆرە باشتر حاڵی دەبین لەڕاستی و خەستی بابەتەکەمان، با هەندێك بڕوانین لەو چارەسەرانە کە ئەمانەن:-

**یەکەم**: مرۆڤی بڕوادار لەهەموو لایەنێکەوە خودای پەروەردگار سودمەندی کردووە لە پێدانی ئەجروپاداشت پێی،لەبەرئەوەی مرۆڤی بڕوادار لەوکاتەی کە خودا خێروخۆشی بۆ دەنێرێت سوپاسی خودا دەکات،وە لەوکاتەی توشی تاقیکردنەوەی خۆی دەکات صەبرو ئارام دەگرێت و پشت بەخودای خۆی دەبەستێت و هەمیشە دەڵێت خێری تێدایە ئەو شتانەی کە بەسەرم دێت،بۆیە صەبر گرتن کرۆکی بەدەست هێنانی بەختەوەریە، وەئەگەر بەردەوام بێت لە صەبرگرتن ئەو کاتە هەرگیس پەشیمانی ڕووی تێناکات.لێرە دا خودای پەروەردگار بەبیرمان دەهێنێتەوەو دەفەرمووێ: (**إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ** ﴿١٠﴾ الزمر).واتە:ئەوانەی کە خودای پەروەردگار تاقیکردوونەتەوە و صەبریان لەسەرگرتوەئەوا بەڕاستی پاداشتیان دەدرێتەوەبەبێ هەژمار.لەڕاستی دائەمە مژدەیەکی

زۆر خۆش وئاسودە بەخشە،بۆئەوکەسانەی صەبریان لەپێش هەموو شتێکەوە داناوە،وە پێشمان وتراوە : (قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ التوبة).واتە: هەرگیس شتێکمان بەسەرنایەت ئەگەر خودای پەروەردگار خۆی لە(الوحل المحفوظ)دا بڕیاری نەدابێ بۆمان،هەرئەویشە بۆخۆی گەورە وسەروەرمانە،موسولّمانان دەبێ پشت و پەنایان هەرخودا بێت ولەهەموو نارەحەتیەکانی ژیانیان دا هەر ئارام بگرن. وەهەرکەسێك لەئارام گریەکەی بەردەوام بێت بۆ گەیشتن بەو مەبەستە رەوایەی کە هەیەتی ئەوا بادلّنیابێت کە خودای پەروەردگار بێ ئومێدی ناکات و لەگەڵ ئەودایە، بەردەوام پێمان دەڵێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٣﴾ البقرة).واتە: ئەی بڕواداران، پەنابەرنەبەر خۆڕاگری و نوێژکردن،لەکاتی ناخۆشی و نارەحەتی دا خۆڕاگربن و بەجوانی نوێژەکانتان بکەن،تاوەکو ببنە خاوەنی پاداشتێکی زۆر،وەبەڕاستی خودای پەروەردگار لەگەڵ ئارام گرتوان دایە.وە خودای پەروەردگار بۆیە لێرەدا باسی نوێژی کردووە لەبەرئەوەی نوێژکردن بنچینەی ئارامیە بۆدەروون، هەرکاتێك کەکێشەیەکت دێتەرێ بەخۆڕاگریەوە دوو ڕکعات نوێژدەکەیت بەخشوعەوە چەندە دڵ و دەرونت فێنك دەبێتەوەو هەست بەئارامیەکی لەبن نەهاتوودەکەیت،بۆیە لەم ڕووەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: (عَجَباً لأمر الْمُؤمِن لايَقْضى الله لَهُ قضاء إلاكان لَهُ خَيراً:إن أصابَتْهُ سراء فَشَكَرَ كانَ خَيراً لهُ،وإن أصابَتْهُ ضَراء فَصبر كان خَيراً لهُ)[1].واتە:کاروکرداری کەسی ئیماندار سەرسامیە، بەڕاستی هەموو کاروباری بەگشتی بۆی بەخێروچاکە دەنوسرێت،ئەمەش بۆ هیچ یەکێك نیە جگەلە ئیمانداران نەبێت،ئەگەر خۆشیەکی توش بێت شوکری خوای تێدا دەکات ئەوا بەخێروچاکە بۆی دەنوسرێت،وەئەگەر ناخۆشیەکی توش بێت ئەوا ئارام دەگرێت و هەردەم

---

١ – رواه مسلیم.

دیسانەوە بۆی دەبێت بەخێروچاکە بۆی.ئەمەیە ڕەحمەت وبەزەیی پەروەردگار بەرامبەر بەندەکانی کە چاکەی نەبڕاوەی بۆیان هەیە. صبرگرتن هیوای گەیشتنی بڕوادارە بە مەبەستەکانی لەبەرئەوەی :-

جوانــی ئیماندار بەوەیا دیارە

بۆصەبرگرتن عەقڵی هۆشیارە[1] .

**دووهەم:** یەکێکی تر لەو هەنگاوانەی کە ئەگەر بەرێکی هەڵی بگری ئەتوانی بگەیت بەڕێگەیەکی تر لەڕێگەکانی تری بەختەوەری،ئەم ڕێگەیەش دوور کەوتنەوەیە لە خۆشەویستی و دڵداری بەشێوەیەکی نادروست(غیرشرعی)،لەبەرئەوەی ڕێگەیەکی زۆر هەستیارە،شەیتان زۆر بەئاسانی دەتوانێت لێیەوە بۆت بێت و وەسوەسە گەنیوەکانی خۆی پێت بۆن بکات و بەرەولای خۆیت بەرێ،مرۆڤی بڕوادار هەمیشە لەکەمین دایە بەرامبەر شەیتان کە هەموو ڕێگەکانی لێ دەگرێت بەڵام جاری واهەیە ئەم ڕێگەیەی لەیاد دەچێت و بەدانەخراوی بەجێی دەهێڵێت،مرۆڤ بیەوێت یاخود نەیەوێت،خودای پەروەردگار هەستی شەهوەتی بۆ داناوە،لەگەڵ ئەمەشدا کاتی شیاووگونجاوی بەکارهێنانی ئەو شەهوەتەشی بۆ دیاری کردووە کەدەبێت لە کاتی دیاری کراو و ڕێگە پێدراوی خۆیدا بەکاری بهێنێت، هەموو کەسێك زۆر تا کەم حەزبەوە دەکات کەسێکی هەبێت تێی بگات و لەپاڵی دا بحەسێتەوەو دڵ خۆشی بکات،بەڵام دەبێت صەبری هەبێت هەوڵی بۆ بدات،تاوەکو خودای پەروەردگار دەرگای بەخێری بەڕوودا واڵادەکات وخێزانێکی صاڵیحەی پێ خەڵات دەکات بۆیە زۆر جاری وا هەیە گەنجان پرسیار دەکەن

---

١ – نوسەر.

که ئایا چی بکەن ،لەکاتێك داکەسێکیان خۆش دەوێت و ناتوانن بی هێنن یاخود وازی لێبهێنن،پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: ئەو کەسەی لەتوانای داهەیە با ژن بهێنێت ئەوەش لەتوانای دا نیە بابەڕۆژوو بێت،ڕەنگە گەنج بتوانێت بەڕۆژوبێت بەڵام ئایا دەتوانێن هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت یان ئایا ئەگەر توانیشی ئەتوانێت هەر خۆی ڕزگار بکات لەم هەستەی کەلەناخی دا بوونی هەیە،سەرەتا دەبێت لەپەرستنەکاندا دڵسۆزی و تایبەت بوون بۆ خودای گەورە هەبێت و ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبێت،چونکە ئەگەر بەو شێوەیە بێت خودای پەروەردگار بەسەر نەفسی دا زاڵی دەکات و پێی دەفەرموویێت: (كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ۚ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ **یوسف**).واتە: ئابەم شێوەیە لەخراپە و داوێن پیسی دەی پارێزین، لەبەرئەوەی بەندەیەکی موخلیص و دڵسۆزی ئێمە بوو.

وەدەبێت هەمیشە تەسلیم بێت لەبەردەم دەرگاری پەروەردگاری خۆی تاوەکو ڕەحمەتی خۆی بەسەرا برێژێت،وە چاوی بپارێزێت لەبەردەم هەموونامەحرەمێك داو سەیری شتی حەرام نەکات تاوەکو داوێنی بەپاکی بمێنێتەوە،چاو هۆکارێکی سەرەکیە بۆ پاراستی داوێن لە کاری خراپ،وە خودای پەروەردگاریش دەفەرمووێ: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ **النور**).ئەلێرەدا خودای گەورە پاراسنتی چاوی لەپێش داوێن دا باس کردووە چونکە چاو داخرا هیچ کێشەیەك بۆ مرۆڤ دروست نابێت بەڵام هەرکە چاوی نەپاراست حاڵی پاراستنی داوێن دەکەوێتە مەترسیەوە.لەشوێنێکی تردا مەدحی ئەو کەسەپارێزکارانە دەکات و دەفەرمووێ: (وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ **المؤمنون**).

یاخود دەتوانی ئەو شوێنە بەجێ بهێڵی کەئەوکەسەی تێدایەو پێوەی پەیوەست بووی، لەبەرئەوەی دوورکەوتنەوە ڕێگەیەکی یەکجار سەرکەوتووە بۆلەبیرکردنی ئەو کەسە،

نەگەڵ ئەمانەش دا ئەگەر لەتوانات دا هەبوو خودا دەرگاری بەڕوودا والاكردی دەبێت: (فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ ﴿٣﴾النساء).واتە: ئێوە هاوسەرگیری بکەن لەوانەی کە خۆتان پێتان خۆشەوچاکە لەئافرەتان.جابۆیە بەڕاستی زۆر گرینگە بزانی چۆن سنورو پێوەرێك بۆ ئەم كارە هەستیارەت دابنێیت، تاوەكو هەم لەدونیا هەم لەقیامەت ببێتە بەختەوەری بۆت،هەروەها خودای پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾الروم).واتە:لەنیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خودای گەورەیە کەهەرلەئێوە و دەرونی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردون بۆئەوەی ئێوە ئۆقرەی و ئارام بگرن لەلایان. وە بەردەوام لەدوای نوێژەکانتدا بەم دوعایە دڵت ئاسودەبکە(اللَّهُمَ إِنِي أَسْأَلُكَ بِأَسْمَاءِكَ الْحُسْنَى أَنْ تَرْزُقَنِي زَوْجاً صَالِحاً أَنْتَ تُحِبُهُ وَتَرْضَاهُ،زَوْجاً صَالِحاً يَكُونُ عَوْناً لِي عَلَى فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَتَرْكَ الْمُنْكَرَات).واتە:خودایە داوات لێ دەکەم ولێت دەپاڕێمەوە بەناوە جوانەکانت،هاوسەرێکی ئیماندارم بەنسیب بکەیت کەخۆت خۆشت بوێتوببێتە یاریدەدەرم بۆ کردنی کردەوەی چاکە و وازهێنان لەخراپەکاری.

بەڵێ بەم شێوەیە خۆبەدوور گرتن لەوخۆشەویستیە ڕێگە پێنەدراوە و هەنگاونان بۆ ئەو جۆرەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی پێی ڕازین،بۆیە دەڵێین:

سەرگەردان مەبە بەلوتفی ئەوین
ئەویــن شێدارە قولێ دەکا بریــــن
ئەوەی هەنگاونــــێ ئالەم ڕێگایــە
خەفەت خان ئەبێ وچاوی هەڵنایە .[1]

---

[1] – نوسەر لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی یەکەم.

**سێهەم:** تاك كاتێك خۆی سەرقاڵ دەكات بەهیواو ئامانجەكانی و بەردەوام بەخەیاڵی گەیشتن پێیان دەژی، ئەلێرەدا زۆر سودمەند دەبێت بەهۆی ئەوەی لەبیری چوەتەوە كە چ خەمێكی هەیە تاوەكو بیریان لێ بكاتەوە، كاركردن بۆ گەیشتن بەهیواكان هەمیشە تاك لەمەیدانی بیركردنەوە لەكێشەكانی دووردەخاتەوە،بۆیە دەبێت مرۆڤ تائەوكاتەی لەتوانای داهەیە هەناسە بدات،چۆك بۆهیچ كێشەوگرفتێك دانەدات تاوەو بتوانێت ڕێگەی بەختەوەری لێ ون نەبێت بگات بەئاسودەیی ناخ،بەڕاستی ئەمەش هۆیەكەی بۆتەوە دەگەڕێتەوە كە پەروەردگار باسی ئەم جۆرە كەسانەی كردووە كە هەمیشە بۆ زانست هەوڵ دەدەن و بەردەوامن لە كۆكردنەوەی زانست، وەڕێزێكی زۆریان لەلای پەروەردگار هەیە،هەروەكو خودای باڵادەست باسیان دەكات و دەفەرمووێ: (**يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ** ﴿١١﴾المجادلة).واتە: خوای پەرودردگار پلەی ئەوكەسانە بەرز دەكاتەوە كەباوەڕیان هێناوەو،ئەوانیش كەزانستیان پێدراوە چەند پلەیەك بەسەر باوەڕداران بەرزیان دەكاتەوە.لەبەرئەوەی ڕێز و شەرەفمەندی لای خودا تەنها بە باوەڕو زانستەوەیە،بۆیە دەبێت ئەوە بزانین كە پلەكان لای پەرودردگار زۆر جیاواز ترن لەو پلانەی كە ئێمە بۆیەكتر دای دەنێین و یەكی پێ بانگ دەكەین، كەسێك كە بەهۆی زانستەكەیەوە لەلای پەروەردگار پلەی بەرز بێتەوە ئەوە دڵنیاشە كە پەروەردگاری خۆی ئاسودەیی و بەختەوەری پێدەبەخشێت،دەتوانین پرسیارێك لەخۆمان بكەین ئایا چ شتێك هێندەی ئەوە دڵ خۆش كەر و خەم ڕەوێنە كە تۆبزانی پەروەردگار پلەی تۆی بەرزكردووەتەوە و جیای كردویەتیەوە لە كەسانی تر بەهۆی زانستەكەتەوە. هەرلەبەر ئەمەیە دەڵێین بەردەوام بوون و خۆیەكلایی كردنەوە بۆ زانست بەڕاستی

لەناوبەری خەم و ڕەش بینیە.لەگەڵ ئەمەش دا مرۆڤ نابێت بوەستێت لەوتنی ئەم وشە جوانانە کەداوای پێ بکات لەپەروەردگاری و بەبێ وەستان بڵێ:(رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴿١١٤﴾ طه). واتە ئەی پەروەردگارم! زانست و زانیاریم زیاد بکە.

هەرلەتەودرەی مەبەستەکەماندا نابێت ئەم مژدە خۆشەی پێغەمبەری ﷺ نازیزمان لەیاد بچێت کەسەبارەت بە ئەو کەسانەی خۆیان یەکلادەکەنەوە بۆ فێربوونی زانست و بەردەوام دەبن لەسەری،دەفەرمووێت : (مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسْ فِيهِ عِلْماً سَهَلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقاً إلَي الْجَنَة)[1] .واتە:هەچ کەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر تا زانستێکی تێدا پەیدا بکات، ئەوا خودای گەورە بەبۆنەی ئەو کاردوە ڕێگایەکی بۆ ئاسان دەکات بۆ چونە بەهەشت.

بۆیە دەبێت بزانین کە ئەم فەرموودەیە موژدەیەکی زۆر خۆشی تێدایە بە شێوەیەك ئەگەر بیری لێبکەینەوە خەم و نائارامی وەدەردەنێت لەدڵماندا.ئەم شتانەی کە باسمان کرد بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری،مەرجێکیان هەیە،ئەویش پێویستە لەگەڵ هەموو ئەم هەوڵانەدا ئیخلاصیەت پێشڕەوی بکات لەبەرئەوەی هەر ئیخلاصیەتە تام و ژێچی کردەوە چاکەکان بەئەنجام دەرەکەی دەبەخشێت ئیخلاصیەت وا لە مرۆڤ دەکات دوور بکەوێتەوە لە قسەکردن،و وای لێ دەکات کە بەهەڵە لەزانست تێنەگات و وای دابنێت کەزانست تەنیا قسەی گەورەیە،نەخێر زانست تەنیاقسەی گەورە نیە،هەروەکو (حمادی)ی کوڕی (زەید)دەفەرمووێ: بە(ایوبم) گوت: ئایا لەم سەردەمەدا زانست زۆرترە یان پێشتر زانست زۆرتر بوو؟ لەوەڵامدا گوتی: لەم سەردەمە قسەی زۆر بووە، بەڵام پێشتر زانست زۆرتر بوو!!.بڕوانەو بیربکەوە چۆن ئەم زانا لێهاتووە زانست وقسەی لێك جیاکردووەتەوە، ڕاستە،کتێب زۆر بووە،قسە زۆر بووە،مشتوومڕو بیروبۆچون زۆر بووە،کەچی زانست و

---

١ – رواه مسلم ومالك في الموطأ وأصحاب السنن.

هەوڵ دان  بۆی بەرەو نەمان و ون بوون چووەو ئەمانەی هەر لەگەڵ دانیە،بەڵکو زانست ئەوەیە کە پێغەمبەرمان لەلایەن خوداوە هێناویەتی بۆ ئوممەتەکەی.

جابۆیە کە ئەم سەردەمە دووڕ کەوتەوە خەڵکی زۆر بەشێوەیەکی هەڵە لە زانست دەگەن ئیخلاصیەتیان ون کردووە بۆیە تام لەکردەوەکانیان نابینن وبەئەستەم دەگەن بەئاسودەیی دەرون و تام کردن لەکردەوە کانیان.

**چوارەم:** خودای پەروەردگار بەبەندەکەی خۆی دەفەرمووێ ئەی بەندەکەم بەردەوام یادوزیکری من بکە منیش لەشوێنێکی باشترو لەلای کەسانی چاکتر وپاکتر باست دەکەم بۆیە مرۆڤ هەر کاتێك دەستی گرت بەو بەرنامەیەی کە خودای پەروەردگار بۆی داناوە و بەردەوام زیکری پەروەردگاری خۆی کرد،ئەوا خودای گەورە لەکاتی کێشەو گیروگرفتدا بەتەنیا جێی ناهێڵێت و پشت و پەنای دەدات،دڵنەوایی پێدەبەخشێ تا ئەو کاتەی لەو گیروگرفتە ڕزگاری دەکات،چونکە بەڕاستی ئەوشتەی کەدڵ پێوەی ئارام دەبێت یادکردنەوەی خودای پەروەردگارە وداواکردنە بەتەنیالەزاتی ئەو،بۆیە خودای پەروەردگارە بۆ خۆی باسی یادکردنەوەی خۆی دەکات کە چ ئارامیەك بەدڵ و دەرون دەبەخشێ ئەگەر بەندە بیکات،بۆیە دەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾﴿٢٨﴾الرعد).واتە:ئەوكەسانەی کەبڕوایەکی چاکوپوختیان هێناوەو، هەر بەیادوزیکری خودا دڵیان دادەمەزرێ و ئاسودە دەبێت،جا چاك بزانن ! تەنیا بەیادی خودا دڵەکان ئۆقرە دەگرن و ئاسودە دەبن، بۆیە باوەڕدارانیش دڵەکانیان هەردەم ئاسودەو دامەزراوە،هەرلەبەر ئەمە پێویستە زۆر بەوردی ئەم ئایەتەی پەروەردگار بخوێنیتەوە چونکە یادکردنەوەی پەروەردگار ڕۆحی شەکەت و دڵی ماندوو تێر دەکات و حەوانەوە بۆ دەرون دابین دەکات بەڕادەیەك کە پەروەردگار یادکردنەوەی لەلا زۆر خۆشەویستەو ئەویش ناوت دەبات لەلای فریشتە بەڕێزەکانی خۆی.مرۆڤ

پێویستە ئەوەی لەیاد نەچێت لەکاتی زیکرو یادکردنەوەی پەروەردگاری خۆی ئاگەداری خۆی بێت و بزانێت چی دەڵێت،ئەم کردەوەیە تام و چێژی خۆی هەیە،ئەگەر بێت و لێی غافڵ بی بێبەش دەبیت و تام لە یادکردنەوەکەت ناچێژی و لەم بازنەیە دەچیتە دەرەوە تا خودای پەروەردگار لەو کەسانەت بگێڕێ کەناویان دەبات و دەفەرمووێ: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾الأنفال).واتە:باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە هەر ناوی خودا هێنرا،دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزەو ترسی لێدەنیشێت،وەهەر کەئایەتەکانیش دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا باوەڕیان زیادوبەهێز دەبێ،چونکە لەکاتی تەنگانە و ناخۆشیدا هەرپشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.واتە پشت وپەنایان هەرئەوە.گەورەیی ئەم ئایەتە واڵە (ئیمامی بخاری)و چەندان زانای تردەکات کە ئەم جۆرە ئایەتانە بکەنە بەڵگەی زیاد بوونی ئیمان و باوەڕ هەرکە ئیمانیش زیادی کرد دەرونیش خاڵیتر دەبێتەوە لەخەم و پەژارە و بەڕوناکی ئاسودەیی ڕۆشن دەبێتەوە.

بۆیە دەڵێین هەر چەندە مرۆڤ زمان بەزیکرویادی پەروەردگار تەڕ بکات هەر تێرنابێت و پێویستی بەزیاتر لەبەرئەوەی خودای باڵادەست خۆی داوامان لێ دەکات و دەفەرمووێ : (اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾الأحزاب).واتە:ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە! یادی خوا بکەن یادێکی زۆر،یانی بێ حەد و بێ سنوور یادی خودا بکەن.وادیارە ئەو شتەی پەیوەندی بەندە بەخودای باڵادەست هەمیشە بەپاکی وبێگەردی وتوندو تۆڵی دەهێڵێتەوە یادکردنەوەی پەروەردگارە لەلایەن بەندەوە،بۆیە هەوڵ بدە دەستی پێوە بگری.

پێغەمبەرمان ﷺ چەندین فەرموودەی بەرزی هەیە سەبارەت بەباوەڕدار کە لەو کاتەی خەم و ناخۆشی ڕووی دەکەن بیخوێنێت، بۆیە بە پێویستی دەزانم ئەلێرەدا دانەیەکیان

باس بکەم، لە (مسند)و (صحیحي ابي حاتم)دا حەدسی (عبدالله)کوڕی (مسعود) هاتووە کە دەفەرمووێ: پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرمووێ: ( مَا أَصَابَ أَحَدًا قَطُّ هَمٌّ وَلَا حَزَنٌ ، فَقَالَ : اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ ، وَابْنُ عَبْدِكَ ، وَابْنُ أَمَتِكَ ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي ، وَنُورَ صَدْرِي ، وَجِلَاءَ حُزْنِي ، وَذَهَابَ هَمِّي ، إِلَّا أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ ، وَحُزْنَهُ ، وَأَبْدَلَهُ بِمَكَانِهِ فَرَحًا " . قَالَ : فَقِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَلَا نَتَعَلَّمُهَا ؟ قَالَ : بَلَى ، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَا أَنْ يَتَعَلَّمَهَا)[1] .واتە: هەربەندەیەك توشی ناخۆشی و خەفەت بێت ئەگەر بڵێت: خودایە من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆم،کوڕی کەنیزەك وکۆیلەی تۆم، نێوچەوانم بەدەستی تۆیە،حوکم وبریارت بەسەرمدا ڕابردوە،بڕیارەکانیشت بەسەرمدا داتپەروەرانەیە، خودایەداوات لێ دەکەم ولێت دەپاڕێمەوە بەهەموو ناوەجوانەکانت کەناوت پێ لە خۆت، یان لەقورئاندا ناردۆتتە خوارەوە،یان فێری کەسێکت کردووە لە دروست کراوەکانت،یان لەزانستی پەنهانی خۆت حەشارت داوە، قورئان بکە بەبەهاری دڵم و نووری سینگم و ڕەوێنەرەوەی دڵ تەنگیم و لابەری غەم و خەفەتم،هەرکەسێك ئەو نزایە بکات ئەوە خودای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەباوبۆی دەگۆڕێت بەخۆشی،کاتێك هاوەڵان ئەمەیان بیست فەرموویان:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ،خەڵکی فێری ئەم نزایە بکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك گوێ بیستی بوو، پێویستە خەڵکی تری لێ فێربکات.بەڕاستی ئەم فەرموودە بەنرخە، خواناسی و یەکتا پەرستی و مل کەچی لەخۆ دەگرتووە،وەتۆی خوێنەریش خۆتی لێ بەهرەمەند بکەو هەوڵی ئەوەش بدە کە کەسانی تریشی لێ فێربکەی. هەربۆیە

---

١ – صحيح رواه(امام احمد) في مسند(٣٧١٢)،(ابن حبان)في صحيحة(٩٧٢)، (الحاكم)في المستدرك (١٨٧٧)،بڕوانە :السلسة الصحيح للشيخ (الأباني) ( ٣٨٣/١).

ئازیزەکانم دەست گرتن بەیادوزیکری پەروەردگارو پابەند بوون بەفەرمان و ڕێنماییەکانی گەوهەری ڕەسەنایەتی ژیانە و بناغەی دروست کردنی ماڵی بەختەوەریتە.

**پێنجەم:** لەژیانی هەموو تاکێکدا قسەی دەوروبەر و قسەی خەڵکی زۆر کاریگەری هەیە لە خەم باربوون و دڵخۆش بوونی ئەم تاکانە،ئەلێرەدا شارەزایی و هیممەتی ئەو کەسە بەدیار دەکەوێتکە چۆن و بەچ شێوەیەك خۆی دەگونجێنێ لەگەڵ ئەم هەموو قسەو ڕەفتارانە،باشترین ڕێگە بۆەوەی کاریگەری قسەی دەوروبەر بەسەرتەوە نەمێنێ ڕەوشت جوانیە،ڕەوشت جوانی هەم خۆشەویست بوونە لەلای خودای پەروەردگار و هەم جێگای کردنەوەیە بۆخۆت لەناو دڵی خەڵکی دا،هەرکەسێك بەهۆی ڕەوشت جوانیەکەی خۆی بناسێنێت،ئەوکاتە دەوروبەرەکەی لێی ڕازی دەبن و کەمتر بەهۆی ئەوانەوە توشی کێشە دەبێت،بائێمە لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوەﷺ فێری ئاکاروڕەوشتی جوان بین کە هەرکەسێك بەخزمەتی دەگەیشت و گوێی لە ڕەوشتە بەرزەکەی دەبوو عاشقی قسە شیرینەکانی دەبوو،وە دەیفەرموو: (إنما بُعِثْتَ لأمكارم الأخلاق)[1].واتە:من ڕەوانە کراوم و هاتووم تا ڕەوشتەکان تەواو بکە. جا بەڕاستی کەسێکی وا خۆشەویستمان ڕەوشتەکان تەواو بکات ئایا شایەنی ئەوە نیە کە چاوی لێبکەین و بەردەوام پێ بەپێی ئەو بڕۆین، ڕەوشت جوانی کلیلی دەرگای بەختەوەری ئەم دونیایەو گەیشتنە بەئاسودەیی و حەسانەوەیە لەو دونیا،وە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (ما من شيء أثقل في الميزان من خلق حسن)[2].واتە:هیچ شتێك نیە قورس بێت لە تەرازووی کردەوەکاندا هێندەی ڕەوشت جوانی. ئەمەش هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو کەسەی بەردەوام دەبێت لەسەر

---

١ – رواه احمد.

٢ - رواه أبو داود(٤٧٩٩) وصححه الشيخ الألباني رحمه الله في صحيح أبي داود.

ڕەوشت جوانیەکەی خودای گەورە بەردەوام چاکەی بۆ دەنوسێت و پلەی بەرز دەکاتەوە تاوەکو تەرازوی کردەوەکانی بەلای ڕاستدا دەکەوێت و قورستر دەبێت،

هەروەکو لەفەرموودەیەکی تردا ئاماژەی بۆ کراوە کە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (إن الرجل ليدرك بحسن خلقه درجة قائم الليل وصائم النهار)[1].واتە:پیاوی باوڕدار دەگات بە پلەی ئەو کەسەی کە بەشەو شەو نوێژ دەکات و بەڕۆژیش بەڕۆژوو دەبێت بەهۆی ڕەوشت جوانیەکەیەوە.کە لەڕووی هەموو کەسێك دەری دەخات و هەمیشە بەردەوامە لەسەری. جابۆیە پێویستە لەو ئەجروپاداشتە خۆمان بێبەش نەکەین،وە ڕەوشت جوانی بێجگە لەوەی بەختەوەری ئەم دونیا پێمان شاد دەکات،موژدەدەریشە بۆ بەدەست هێنانی لێخۆش بوونی پەروەردگار کە بەهەشتە بۆیە پێغەمبەری نازدارمانﷺ مژدەمان پێدەدات و ئاگەدارمان دەکاتەوە،و دەفەرمووێ: (عليكم بحُسن الخُلقْ ، فإن حُسَن الْخُلق في الجَنة لا مَحالة ، وإياكُم وَسُوء الْخُلق ، فَإن سُوء الْخُلق في النار لا محالة)[1].واتە: لەسەر ئێوە بێت ڕەوشت جوانی،ڕەوشتتان جوان بکەن،لەبەرئەوەی ئەو کەسەی کەڕەوشتی جوان دەکات لەبەهەشتە بەبێ گومان، وە ئاگەدارتان دەکەمەوە لە ڕەوشت خراپی، لەبەرئەوەی ڕەوشت خراپ لەدۆزەخە بەبێ گومان.ئەمانە بەڕاستی هەموو موژدەیەکن کەتەنیا بیریان لێ بکەیتەوە دڵت خۆش دەبێت سەرەڕای جێبەجێ کردن و هەوڵ دان بۆی،دەبێت ئاگەداری ئەوەش بین ئەگەرکەسێك بەرەو ڕومان قسەیەکی نەشیاوی کرد نابێت خۆمان دابەزێنینە ئاستی ئەو تەنیا بەچەند وشەیەکی جوان پێویستە وەڵامی بدەینەوەو خۆمان

---

١ – رواه (امام أحمد)و (الحاكم)عن (عائيشة)رضية الله عن هو،في صحيح الجامع برقم(١٦٢٠).

١ – لەکتێبی(روح البيان)جلدی(١ )لاپەڕە(١٠٨)،نوسینی( إسماعيل حقي بن مصطفى الإستانبولي الحنفي الخلوتي).

بپارێزین لە هەڵچوون،چونکە ئاکامی هەموو هەڵچوونێك پەشیمانیە،ئەو کەسەی کۆنترۆڵی تورەیی و هەڵچوونی خۆی دەکات و ڕێز لەو کەسانە دەنێت کە لەڕووی دا وتەی بێ ڕێزی ئاراستە دەکەن ئەوا خودا پەروەردگار پلەی بەرز دەکاتەوە و لەبەهەشتەکەی خۆی دا جێگەی بۆدەکات هەروەکو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: (أكثر ما يدخل الناس الجنة تقوى الله وحسن الخلق)[1] .واتە: زۆربەی ئەو خەڵکانەی کەدەچنە بەهەشت ئەوکەسانەن کە لەخودا دەترسن و ڕەوشتیان جوانە،بۆیە زۆر پێویستە ئاگەداری گوفتاروڕەفتارەکانمان بین بەرامبەر دوروبەر،تاوەکو دووربین لەو قسەنەشیاوانەی کەخەڵکی بۆیان هەیە لێمانی بکەن ودەبێت بەجوانترین شێوە وەڵامیانی پێ بدەینەوە تاوەکو لەگێروگرفت و توش بوون بە دڵ توندی دوور بکەونەوە،هەربۆیە شاعیری گەورەی کورد (پیرەمێرد)ی لەم ڕووەوە دەڵێت:

**زمـــانت بـــگـــەڕێت بـــەچاکە**

**دۆست و دوژمنت پێت ئەڵێ کاکە.**

**شەشەم**: هەمیشە هەندێك چارەسەر هەن کە زۆری خەڵکان لەبیریان ئەچێتەوە تا وەکو چارەسەرێکی بەردەوام بەکاری بهێنن،یەکێك لەو چارەسەرە ون بوانە،سەردانی کردنی نەخۆش و پەککەوتەکانە،ئەو نەخۆشانەی کە ماوەیەکی زۆرە لە جێگایا کەوتوون چاوەڕوانی سۆزو ڕەحمەتی خودای پەروەردگارن کە ڕزگاریان بکات و شیفایان بدات، ئەوکاتەی مرۆڤ دەچێتە لای نەخۆشێك لەچەندین ڕووەوە سودمەن دەبێت لەو سەردانە هەم لەڕووی دەرونیەوە هەم لەڕووی هیزرو بیرکردنەوە هەم بیرکردنەوە لە دەسەڵات و

---

١ – رواه (الترمذي) و(الحاكم).

توانای پەروەردگار،بۆیە پێویستە بەو سودانە ئاشنابین تاوەکو سەردانی کردنمان بۆلای نەخۆش زیاتر لەلا خۆشتر بێت، مرۆڤ کاتێك دەڕوات بۆ سەردانی نەخۆشێك ئەلەوێدا چەند شتێکی بیردەکەوێتەوە،وا لەدڵی دەکەن جۆرە ئاسودەییەك هەست پێبکات کە لەکەم شوێندا ئەم ئاسودەییە هەست پێ ئەکرێت،ئەویش کاتێك کە سەیری ئەم نەخۆشە دەکات لەچ حاڵێك دایە،خۆی بەبیردەکەوێتەوە حاڵی ئەم چەندە باشە وحاڵی ئەم نەخۆشە چەندە خراپە،هەست دەکات کە لەش ساغی نیعمەتێکی گەورەیە بۆ مرۆڤ بۆیە تاڕادەیە دڵی خۆش دەبێت و ڕەنگە جاری واش هەیە سوپاسی خوداش بکات لەکاتی بینینی ئەم مەشهەدە،ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر هەست بەوە دەکات کە چەندە کەم تەرخەم بووە بەرامبەر بە پەروەردگاری کە سوپاسی کەم کردووە،لەلایەکی تریش ئەم سەردانەی دەبێتە هۆی دڵخۆش بونی ئەم نەخۆشە و کەمێك لەو ئازارەی کەم دەکاتەوە کە بەسەری هاتووە،ئەمانەی باسمان کرد تەنیا ئەو شتانەبوون کەسەردانی کەر هەستیان پێ دەکات، بەڵام ئەوەی جێگای باس کردن و ڕوانینە ئەوەیە ئەو کەسەی سەردانی لای نەخۆشەکە دەکات چ ئەجرو پاداشتێك بۆخۆی مسۆگەر دەکات لەلای پەروەردگار بەمەرجێك مەبەستی لەچونی ئەو سەردانە بۆلای نەخۆشەکە تەنیا ڕەزامەندی پەروەردگار بێت، یەکێك لەومژدە دڵ هەژێن و ئارام بەخشانە ئەوەیە کە پێغەمبەرمان ﷺ سەبارەت بەو کەسانەی سەردانی نەخۆشێك دەکەن و دەفەرمووێ: (من زار أخاً له في الله تعالى، أو عاد مريضاً، نادى مناد من السماء: طيبوا طاب ممشاكم بثواب من الجنّة مبارك)[1].واتە: هەرکەسێك سەردانی برایەی بکات لەپێناو ڕەزامەندی خودای پەروەردگار،یان سەردانی نەخۆشێکی لەجێ کەوتوو بکات،بانگ کەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات دەڵێت:ئەو

---

١ – لەکتێبی(الجعفريات ) مستدرك الوسائل بەرگی(٢)لەپەڕە(٧٧)حەدیثی(١٤٦٠)نوسینی (محمد بن محمد اشعث).

سەردانەی کەکردت پاك بوو،وە بووە پاداشتێك بۆت لە بەهەشتی پیرۆزدا.بەهەشت خۆی لەخۆی دا پاداشتە ئەی نەبێت ئەو ·پاداشتەچی بێت کە لەبەهەشتا بۆ ئەو کەسە ئامادەکراوە کە سەردانیەکەی کردووە،لەوە گەورەترودڵ خۆش کەرتر،ئەجروپاداشتێکی ترە کە ئەویش بەڕاستی دڵەکان ئاوەدان دەکەنەوە بەبیستنی کە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: (ما من عبد مسلم يعود مريضاً إلاّ صلّى عليه سبعون ألف ملك من ساعته التي يعود فيها، إن كان نهاراً حتّى تغرب الشمس، أو ليلا حتّى تطلع)[1].واتە: هیچ بەندەیەکی موسوڵمان نیە کە سەردانی نەخۆشێك دەکات،ئیلا (٧٠)هەزار فریشتەی داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەن،ئەگەر سەردانیەکەی لەڕۆژدا بێت بوو تاخۆر ئاوادەبێت، وەئەگەر سەردانیەکەی لەشەودابوو تائەوکاتەی کە خۆر هەڵ دێت،ئەو فریشتانە داوای لێخۆش بوونی بۆدەکەن لەلای خودای پەروەردگار.خوێنەری ئازیز بی هێنە خەیاڵت کاتێك دایکت یاخود باوکت یان هەرکەسێکی تر دوعات بۆدەکات و تۆش لەشوێنێکەوە گوێت لێیە چەندە دڵ خۆش دەبێت بەو دوعا کردنە،ئەی باشە کەسانێکی پاك و بەڕێز کە فریشتەی خودان،خودا تەنیا بۆئەوە دروستی کردوون کە تەسبیحاتی ئەو بکەن دوعای خێرت بۆ بکەن ئەبێت چ دڵ خۆشیەك ڕوو لەدڵت بکات،و ئەو خەفەتانەی کەلەناخت دا بوونی هەیە ڕامالێت و ئاوەدانی بکاتەوە.بۆیە وا پێویستە زۆر گرینگی بەو خاڵەبدەین،لەبەرئەوەی هۆکارێکی زۆر دیارەو گرینگە بۆ دەستەبەر کردنی بەختەوەری لەم دونیاو ئەو دونیا، تاوەکو لەو کەسانە بیت کە پێغەمبەرمان ﷺ بۆمان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمووێ:

---

١- لەکتێبی(دعائم الإسلام)بەشی١ لاپەڕە(٢١٨)**مستدرك الوسائل** بەشی٢ لاپەڕە(٧٨)حەدیسی (١٤٦٨) نوسینی (**القاضي أبو حنيفة النعمان بن محمد المغربي**).

(إذا كان يوم القيامة نادى مناد، العبد المؤمن إلى الله (أدنى العبد المؤمن إلى الله عزّ وجلّ)، فيحاسبه حساباً يسيراً، ويقول: يا مؤمن ما منعك أن تعودني حين مرضت؟ فيقول المؤمن: أنت ربّي وأنا عبدك، أنت الحيّ القيّوم الذي لا يصيبك ألم ولا نصب، فيقول عزّ وجلّ: من عاد مؤمناً فيّ فقد عادني، ثمّ يقول له: أتعرف فلان بن فلان؟ فيقول: نعم يا ربّ، فيقول له: ما منعك أن تعوده حين مرض، أما أنّك لو عدته لعدتني، ثمّ لوجدتني به وعنده، ثمّ لو سألتني حاجة لقضيتها لك ولم أردّك عنها) [1] .واته:کاتێك کەرۆژی قیامەت بەرپادەبێت،بانگ کەرێك بانگ دەکات، ئەوبەندەیەی کە بڕوادارە بانزیك بێتەوە بۆلای پەروەردگار،کاتێك کەنزیك دەبێتەوە، خودا لێپرسینەوەیەکی لەگەڵ دەکات بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان،وەپێی دەڵێت:چ شتێك وای لیّ کردی کە سەردانم نەکەی کە نەخۆش بووم، باوەڕدارەکە دەڵێ: تۆ پەروەردگاری منی منیش بەندەی تۆم،تۆ هەرزیندوو و نەمری و ڕاگری عەرشی کە هیچ شتێك ناتوانێت زیانت پیّ بگەیەنێت، خودای پەروەردگاریش پێی دەفەرمووێ: هەر کەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات لەپێناو ڕەزامەندی من ، بەبیّ گومان سەردانی منی کردووە،پاشان پێی دەڵێت:فڵانی کوڕی فڵان دەناسی؟،ئەویش دەڵێ:بەڵێ ئەی پەروەردگارم، خوداش دەفەرمووێ: ئەدی چ شتێك ڕێگری لەتۆ کرد کە سەردانی بکەی،ئەگەر سەردانیت بکردایە من لەلای بووم،بەو سەردانی کردنەت منت لەلای دەدۆزیەوە لەویّ پاشان داوای هەر شتێکت بکردایە لێم پێتم دەبەخشی و بۆتم جیّ بەجیّ دەکرد.سەردانی کردنێك ئابەوشێوەیە نزیکمان بکاتەوە لەخودای خۆمان دەبێت چشتێك هەبێت وامان لیّ بکات بۆی نەڕۆین و ئەنجامی نەدەین تا لەو پاداشتە گەورەیە بیّ بەش نەبین و داوای هەر شتێك لەپەروەردگارمان بکەین بۆمانی بکات.بۆیە دەڵێن پیاوێك: چووەلای (ام الدرداء) خوالیی ڕازی بێت ،گوتی:دڵم زۆر ڕەقەو هیچ وەرناگرێت و فرمێسك

---

١ – نەکتێبی (مکارم الأخلاق )و (مستدرك الوسائل بەرگی ٢لاپەڕە (٧٦)حەدیث(١٤٥٧ )نوسيني العلامة الحسن بن الفضل الطبرسي.

نایەتە خوارەوە لە چاوانم تاوەکو دڵم ئاسودەبێت،ئەویش فەرمووی:بەڕاستی ئەمە گەورەترین دەردونەخۆشیە،بەڵام برۆ سەردانی نەخۆش بکەو بەدوای جەنازەدا برۆ،هەروەها برۆ سەر لێواری گۆڕەکان تاوەکو دڵت نەرم دەبیٚ،ئینجا پیاوەکە وای کرد کە فەرمانی پێکرابوو،دەڵێ گەڕایەوە لای پێی گوت:ئەی ام الدرداء خودای گەورە پاداشتی بەخێرت بداتەوە بەڕاستی ئامۆژگاریەکەت کاری لێم کرد دواى جێبەجیٚ کردنی [1].

وەدەبێت ئێمەش کەمێك دڵنەوایی ئەو کەسانە بدەینەوە کەنەخۆشن و ئەم دێرانەی پێش و دەخوێننەوەو لە چینە لەش ساغەکەنین،بۆیە لە چەند دێرێك داپێیان دەڵێین:

ڕێزی خالق بۆت نەخۆش کەوتنە

بـــیٚ هیوابوون و نەفس بەستنە

ئیمتیحانێکە خـالق پێت ئەکا

تا لەفیردەوسا جێگەت بۆ بکا [2].

**حەوتەم:** کاتێك کە مرۆڤ تەنیایی بەجیٚ دەهێڵیٚ و لەناو بیرکردنەوە نەرێنیەکانی ڕادەکا بەرەو شوێنێکی تر تا بۆ ساتێکی کەم ئارامی بەمێشکی خۆی ببەخشێت،ئەمە چۆن دەبیٚ ،مرۆڤ ئەگەر بەبەردەوامی ئالودەی مەجلیس چاك وباش بێت بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو دەتوانێت ڕزگاری بێت لەو بیرۆکە خەم هێنانەی کە لەکاتی تەنیایی دا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە،دانیشتن لەگەڵ کەسانی باش وبیرفراوان خۆی لەخۆیدا دڵ خۆشیەو ئاسودەیی بەمرۆڤ دەبەخشیٚ،بەتایبەتی ئەو مەجلیسانەی کەیادی خودای تێدا دەکرێت و باسی بەسەر هاتوو سەرگوشتەی پیاو صالحان و عایفانی تێدا باس دەکرێت،لەبەرئەوەی

---

١ – لەکتێبی (مرشد الخطيب)لاپەڕە (٤٥٠)نوسینی(عبدالرحمان المصطاوي).

٢ – (نوسەر) لەکتێبێکی ترم بەناوی (ڕاستی تەمەن)بەرگی دووهەم.

بەپێی پێویست لەکاتی گوێگرتن لەو بابەتانە هەست بە پەندوعیبرەتەکانی ناوی دەکرێت و دەبیتە مایەی ئەزموون بۆ ئەو کەسەی کە لەو مەجلیسە دا ئامادەیە،وەبێگومان باشترینی دانیشتنەکان ئەودانیشتنانەن کە پاك و بێ گەردن دوورن لەخەوشی غەیبەت و درۆ و قسەی بێسود،وە ئەو دانیشتنانە لەلای پەروەردگار زۆر خۆشەویستە و بەرێزە،وە مەجلیسی یادکردنەوە پەروەردگار ژیانەوەی دڵەکانە،وەگەشەی ئیمانە،پاك بوونەوەی نەفسە،رێگای بەختەوەریە،سەرکەوتن ودڵ خۆش بوونە لەدونیاو قیامەت، هەربۆیە پێغەمبەری نازدارمان ﷺ بەبەردەوام وەسیەتی بەهاوەڵانی خۆشەویستی کردووە کە دەست بگرن بە مەجلیسی زیکر،لەبەرئەوەی ئەو شوێنانەی کە یادکردنەوەی خودای تێدا دەکرێت دوورە لە قسەی بێ سود،بەشوێنێکی پیرۆز ناوی هێنراوە لەلایەن پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ،هەروەکو بەئیمان داران دەفەرمووێ: (إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا ،قَالُوا : وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ ؟ قَالَ: حِلَقُ الذِّكْرِ)[1].واتە: کاتێك بەلای باخچەکانی بەهەشتدا دەڕۆن بەشی خۆتان هەڵگرن،وتیان باخچەی بەهەشت کامانەن؟ فەرمووی: کۆڕی یادکردنەوە(مجلس الذكر)،یاخود بازنەی زیکر کردن یان مزگەوتەکان یان چوون بۆلای مامۆستایەکی ئاینی لەکاتی وانەوتنەوە بەفەقێیەکانی لەمزگەوت دا، لەبەرئەوەی لەو مەجلیسانە دا فریشتەی بەرێزی پەروەردگار ئامادە دەبن، پێچەوانەی ئەو دانیشتنانەی کە قسەی نەشیاوی تێدا باس دەکرێ و شەیتانەکان ئامادە دەبن لەوێ، بۆ ئەوەی خۆمان زیاتر بەدوور بگرین،خودای پەروەردگار ئاگەدارمان دەکاتەوە کەنابێت ئێمە مەجلیسی چاك لەبیر بکەین دەنا توشی هەڵەو کاری نارەوا دەبین بەهۆی شەیتانەوە، بۆ یەخودای پەروەردگار دەفەرمووێ:(وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ

---

١-رواه أحمد (١٥٠/٣) ، والترمذي (٣٥١٠) ، وحسنه الألباني رحمه الله في (صحيح سنن الترمذي ) (٢٧٨٧).

نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴿ ٣٦﴾الزخرف).واتە: هەرکەسێك لەڕاست یادی خودای پەروەردگار ڕوو وەربگێڕێ ئەوا ئێمە شەیتانێکی بۆ موسەخەر دەکەین،هەردەم هاوڕێی دەبێت و لێی جیانابێتەوە.بەمانایەکی تر ئەو کەسەی دوور بکەوێتەوە لە مەجلیسی زیکرو زیاتر قسەی بێ سود بکات بێجگە لەیادکردنەوەی پەروەردگاری یان هەر قسەیەکی خێربێت ئەوکاتە هاوەڵ و هاودەمی شەیتانێك دەبێت و کردەوەی نەشیاوی لەپێش چاو جوان دەکات،وەپێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات کە کاتێك لەسەر ڕێگاکان دادەنیشین و بازنە دەبەستن دەفەرمووێ: (إياكم والجلوس بالطرقات قالوا يا رسول الله لا بد من مجالسنا نتحدث فيها فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم فإذا أبيتم إلا المجالس فأعطوا الطريق حقه قالوا وما حق الطريق يا رسول الله قال : غض البصر وكف الأذى ورد السلام والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)[1].واتە: ئاگەداربن ئێوە لە دانیشتنەکانتان لەسەر ڕێگاکان،وتیان ئەی پێغەمبەری خوداﷺ،دەبێت دابنیشین و قسەبەکەین تێیدا، پێغەمبەریﷺ فەرمووی: ئەگەر دانیشتن لەسەر ڕێگاکان و مەجلیستان گرت مافی ڕێگاکە بدەن،وتیان مافی ڕێگا چیە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ،فەرمووی: چاوتان بپارێزن و دایبگرن، وە ئەگەر شتێك زیانی دەبوو بۆخەڵکی لەسەر ڕێگا لای بدەن،وە وەڵامی سەلام بدەنەوە،و فەرمان بەچاکە بکەن و ڕێگری لە خراپەبکەن .بەڵێ ئازیزان بەو شێوەیە مافی ڕێگا دەدرێت بەتەواوەتی، نەوەکو تەنیا قسەی دونیاوی تێدا بکرێت وخوانەکردە باسی عەیب و نەقسی ئەم و ئەوی تێدا بکرێت و لەبەر زۆر بلێی ئاگەداری ئەو سەلامانەبن کە لێیان دەکرێت،جا بۆیە دانیشتن لەو مەجلیسەکان چ لەماڵان بێت یاخود لەمزگەوت یان ڕێگاکان دەبێت زۆر ئاگەداری ئەوە

١ - . رواه الشيخان، البخاري (٥٨٥٧ ) ومسلم (٢١٢١).

بین کەچی دەڵێین و چی تێدا باس دەەین،لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺئاگەدارمان دەکاتەوەو فێرمان دەکات کەئەگەر لەمەجلیسێك دا بدوێین و قسەی بێ سودی تێدا کرا پاش هەڵسانمان لەوێ چی بڵێین،

هەروەکو ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرمووێ:(**من جلس في مجلس فكثر فيه لغطه فقال قبل أن يقوم من مجلسه ذلك سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك إلا غفر له ما كان في مجلسه ذلك**)[1] .واتە:هەرکەسێك لەمەجلیسێکا، ئەگەر لەو مەجلیسە یا قسەی لهولعب و لغوەی زۆر تێدا کرا پێش ئەوەی هەڵبستێ لەو مەجلیسە با ئەم زیکرە بخوێنێ: (**سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك**) ئیلا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت لەپاش هەڵسانی لەو مەجلیسە.بەڕاستی ئەمەش یەکێکە لە مژدە خۆشەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺبۆیە نابێت لەبیری بکەین و بەردەوام بین لەسەر ئەنجام دانی،و ئەم زیکرە بەرزە ئەز بەربکەین.

ئەلێرەدا لەپاش خوێندنەوەی ئەم دێرانەی پێشوو بۆمان ڕوون بویەوە بەژداری کردن لە مەجلیسی چاك و پاك دەبێتە مایەی چ بەختەوەریەك بۆ مرۆڤ و ڕزگار بونیەتی لەوبیرۆکەخراپانەی کە شەیتان بۆی دەهێنێت لەکاتی تەنیایی داولەناو مەجلیسی لەغوە دا، ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لێمان تەئکید دەکاتەوەو کەخۆمان لەو مەجلیسانە بەدوور بگرین تا توشی حەسرەتو ناخۆشی نەبین،کە پێمان دەفەرمووێ: (**ما من قوم جلسوا مجلسا لم يذكروا الله فيه إلا رأوه حسرة يوم القيامة**)[2] .

---

١ - رواه الترمذي(٣٤٣٣) .
٢ - . رواه أحمد (٧٠٥٣).

واتە: نیە هیچ کۆمەڵێك کە دانیشن لەشوێنێکا و یادی خودای تێدا نەکەن و قسەی بێ سودی تێدابکەن ئیلا ئەو مەجلیسە بۆیان دەبێتە حەسرەت و ناخۆشی و سەختی ڕۆژی دوایی.جابۆیە پێویستە بەردەوام و بێ بڕانەوە دەست بگرین بەو وەسیەتە پیرۆزەی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ تاوەکو دڵنیابین کە بوینەتە خاوەنی دڵێکی ئەمین و ئەمان و پڕلەئیمان، بۆیە:

یادی خودا بکە بەوتەیەکـی جوان

بالات ڕۆشن بــێ ئاسودەیی ژیان

کەسێك بۆ خودا خۆی بصولحێنێ

دایە دڵ خۆشی بۆ خۆی ئەڕوێنێ.[1]

**هەشتەم:** مرۆڤ لەوکاتانەی کەلەگەڵ کەسێکی نزیکی یاخود هەرکەسێکی تردا قسە دەکات دەبێ ئاگاداری قسە کانی بێت و خۆی لەڕاستی لا نەدات،لەبەرئەوەی خۆلادان لەڕاستی بەواتایەکیتر نەکردنی قسەی ڕاست،جۆرە نامورتاحیەك بەمرۆڤ دەبەخشێت کە ئەویش ویژدانە،مرۆڤ لەکاتی قسە کردن دا ئاگەداری زمانی خۆی نەبێت کەچ وشەیەکی لێ دەردەچێت و بەبێ گوێ دان دەی کات ،ئەوکاتە جارجار قسەی ناڕاستیش تێکەڵ بەوتەکانی دەبێت ئەوکاتەی کە مەستە بەگفتوگۆکردنەوە،یان جاری واهەیە بابەتێك دەگێڕێتەوە وەکو خۆی نای گێڕێتەوەو سەرو گوێی بۆزیاد دەکات،تاقسەکانی خۆی پێ بڕازێنێتەوە بەڕاستی ئەمە سیفەتێکی زۆر نەشیاوەو مرۆڤ بەرەو کردنی درۆ دەبات،

[1] – (نوسەر)لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی دووهەم.

وەیەکێك لە سیفەتەکانی مونافیق ئەوەیە کە لەکاتی قسەکردن دا درۆ تێکەڵی بابەتەکە دەکات،بۆیە خۆپاراستن لێی گەوهەرە بۆ تەمەن،حەسانەوەیە لە دونیای ئەو لا، وەخودای گەورە شیرینی دەکات لەپێش چاوی خەڵکی،بۆیە پێغەمبەرمانﷺبەچەند وشەیەکی زۆر جوان وەسفی کەسێکمان بۆ دەکات کەئەگەر قسەی ناڕاست بکات و بەردەوام بێت لەسەری ناوی چۆن تۆمار دەکرێت لەلای پەروەردگار،کە دەفەرمووێ: (وإيَّاكم والكذب، فإنَّ الكذب يهدي إلى الفُجُور، وإنَّ الفُجُور يهدي إلى النَّار، وما يزال الرَّجل يكذب، ويتحرَّى الكذب حتى يُكْتَب عند الله كذَّابًا)[1] .واتە:ئاگەداری درۆکردن بن نەکەن بی کەن، چونکە درۆکردن ڕێنمونیت دەکات بەرەو هەموو تاوانەکان و تاوانەکانیش ڕێنمونیت دەکەن بەرەو ئاگری دۆزەخ،وە بەردەوام کەسێك درۆ دەکات و بەشوێن درۆوەیە هەتاوەکو لەلای خوداش ناوی بەدرۆزن دەنوسرێت.خودای گەورە پەنامان بدات و هیدایەتمان بدات لەو کەسانە نەبین،بۆیە ئەزیزان هەرکاتێك کەلەکاتی قسەکردن دا یاخود پرسیارێکت لێ دەکرێت قسەیەکی ناڕاستت کردوو پاشان ویژدانت نائاسودەبوو، ئەوکاتە بزانە ئەو قسەیەی کەکردووتە هەم و خەم و ناخۆشی بۆت دەستەبەر کردووە،زوو بەخۆ داچونەوەیەکی خێرابکەیت و بڕیار بدەی کە دووبارەی نەکەیتەوە تا لەئازاری ویژدان ڕزگارت بێت و هەست بەتامی ڕاستگۆییەکەت بکەی، وە نابێت لەقسەی ڕاست بترسیت و وادابنێیت ئەگەر بیکەی توشی کێشە ئەبی، نەخێر! ئەمە بیرکردنەوەیەکی ئیفلیجانەیە تابۆت دەکرێ لەکاتی قسەکردن دا ڕاشکاوانە ئەو قسە ڕاستانەی کە لەناختدا بوونی هەیە دەری ببڕە،چونکە ڕاستی تایبەت مەندیەکی هەیە،هەرچەندە لێی لێی بترسی سەر بەرزت دەکات بۆیە بیکە،وە پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێ: (قال رسول الله صلى الله عليه وسلم إن الصدق يهدي إلى البر وإن

---

[1] – رواه البخاري(٦٠٩٤)،ومسلم (٢٦٠٧).

البر يهدي إلى الجنة وإن الرجل ليصدق حتى يكتب صديقا)[٢].واتە:ڕاستگۆیی ڕێنمونیت دەكات بۆ چاكە وە چاكە ڕێنمونیت دەكات بۆ چوونە بەهەشت،وەكەسێك بەردەوام دەبێت لەڕاستگۆییەكەی هەتا لەلای خودای پەروەردگار ناوی دەنوسرێت بە ڕاستگۆ.ئەم وتە جوانانەی خۆشەویستمان پێویستە لەسەر تابلۆیەك بی نەخشێنین و لەسەر دیواری ماڵەكانمانی بدەین،لەبەرئەوەی هەرجارێك چاومان كەوتە سەری بیرمان بكەوێتەوە كە چ پاداشتێكی دڵ خۆش كەر چاوەڕێمانە ئەگەر لەسەری بەردەوام بین و قسە ڕاستەكان بەزەوی دانەدەین بۆقسە ناڕاستەكان، لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ بەردەوام بێت لەسەر ئەو ڕاستگۆییە هیچ شتێك هێندەی ئەو قسە ڕاستانە ئاسودەو دڵ خۆشی ناكەن، وە هیچ شتێك هێندەی درۆ كانیش نائاسودەیی و دڵ توندی بۆ ناهێنن.مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی گەشتی ڕاستگۆییەوە بگات بەكەش كەشانی سۆزومیهرو ڕەحمەتی پەروەردگاری خۆی و لەوێوە بەباڵی ئاسوودەییەوە بفڕێت بەرەو باغی ئاسودەیی ژیانی.

**نۆیەم**: هەندێك جا مرۆڤ خۆی خۆی توشی دڵەڕاوكێ دەكات و ئەوەندە بیر لە خۆی دەكاتەوە تاوای لێ دێت تەنیا بیر لە قسەی خەڵك دەكاتەوە كە ئاخۆ چی پێ دەڵێن، كەچی لەڕاستیش دا هیچ قسەیەكی پێ ناڵێن،ئێمە مەبەستمان لەوەیە ئەو كاتەیە كە مرۆڤ ئالودەیی پۆشتە كردن و وێڵی پۆشینی جل و بەرگی جوان دەبێت،مرۆڤ ئەگەر زۆر خۆی بەپۆشینی جل و بەرگەوە خەریك بكات وای لێ دێ تەنیا بیرلەوە دەكاتەوە كە چ جلێك لەبەربكات و بەجوانی دەربكەوێت لەپێش چاوی خەڵك،وەلەلایەكی تریش ئەو كەسە ڕەچاوی ئەوەی كردووە كە خەڵكی زۆربەی بەپێی جۆری جلّ و بەرگ بڕیار لەسەر كەسەكانی دەوروبەریان دەدەن،بۆیە دەبێت بەپێی پێویست لەبیرنەكەین كە گرینگی دان تەنیا بەجوانی لەشولار و ڕوخسار هیچ بەرهەمێكی نابێت،لەبەرئەوەی ئەو كەسەی تەنیا

---

[٢] - رواه مسلم (٢٦٠٧).

بیرله جوانی و پۆشتەیی لەش و لارو ڕخساری دەکاتەوە لەکۆتایشدا ناخی بەناشرینی دەمێنێتەوە،دەبێت ئێمە خۆمان پێوانە بکەین بەپێوانەی ئیمانمان تابزانین ئاخۆ چەندە جوانین،بەرێزترینمان لەلای پەروەردگار پۆشتەترینمان نیە،بەڵکو چاکترین و پاکترین و بەتەقوا ترینمانە، ئەگەر تێبینیتان کردبێت ئەو ئافرەتەی یاخود ئەو پیاوەی کە دایمە خەریکی خۆڕازاندنەوەیە لەکاتی چونە دەرەوە،بەردەوام قەلەقەو بیری لەلای خۆی نیە،ئەمەش لەبەرئەوەی هەربیری لەلای ئەوەیە خەڵکی چۆن سەیری ئەکەن و بەلای خەڵکەوە چۆنە،یان ئەویان بەلاوە ڕێك پۆشە یان نا،بۆیە بەڕاستی گرینگی دان بەناخ و دەرون پێویستە دواتر ڕوخسار و لەشولار،بەتایبەتی لەم چەرخ و سەردەمەی ئێستامان دا لەزانکۆ و پەیمانگاکان ئەمە دیاردەیەکی زۆر باوە،ئەو کەسەی کە گرینگی بەخۆی نادات و جلەکانی زوو زوو ناگۆڕێت ،ئەوە دەبێتە جێگەی قسەوباسکردن لەناو قوتابیەکان و بگرە زۆر جار بەچاوێکی تر سەیر دەکرێن و جاری واش هەیە گاڵتەیان پێ دەکەن، هەرکاتێك تاك لەخۆی تێگەیشت کە لەم دونیایە دا پەیامی چیە،ئەوەندە گرینگی بەخۆی نادات لەڕووی دەرەوە، بەڵکو زیاتر گرینگی بەڕازاندنەوەی ناخی خۆی دەدات،لەبەرئەوەی دەزانێت خودایەك هەیە کەتەنیا لە دڵ و دەرونی دەروانێت و جل و بەرگی باش لای ئەو بایەخێکی ئەوتۆی نیە،هەروەکو پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرمووێ: (إن الله لا ينظر إلى أجسامكم، ولا إلى صوركم، ولكن ينظر إلى قلوبكم)[1] .واتە: خودای پەروەردگار سەیری لەش و لارو ڕوخسارتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکانتان دەکات. ئەمەش واتە هەرچەندە لەڕووی دەرەوە جوان و ڕێك بیت کە دڵ و دەرونت پڕنەبوو لە نووری ئیمان و تەقوا ئەوکاتە هەر ئاسوودەیی ئاوڕت لێ ناداتەوەو لای پەروەردگار ئارامیت بۆ ڕەوانە ناکرێت.

---

١ - رواه مسلم.

جابۆیە هەرکەسێك لەبەرجوان کردنی ڕوخسار و لەش ولاری ئاگاداری دڵی نەبێت کە چی بەسەر هاتووە ئەوکاتە لەبەختەوەری و حەسانەوەی دەروونی دوور دەکەوێتەوە،هەموو ئەمانەش پێمان دەڵێ کە ئێمەی مرۆڤ پێویستمان بەدڵێکی گەڕاوەو پڕلە نووری ئیمانە تاوەکو لەلای پەروەردگار یەکێك بین لەوکەسانەی کە ناومان بەدڵکی ڕوناك و جوان تۆمار دەکرێت،هەروەکو خودای پەروەردگار باسی ئەو کەسانە دەکات کە بەدڵێکی سەلامەتەوە دەگەڕێنەوە بۆلای ئەوانە کێن؟دەفەرمووێ: (مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُنِيبٍ ﴿٣٣﴾ سورة ق). واتە: ئەو کەسەی کە لە پەروەردگاری خۆی ترساوە لە پەنهاندا،بەدڵێکی گەڕاوە بۆلای هاتووە.واتە ئەو کەسانەی دڵی خۆیان صوڵحاندووە و بەگوێرەی فەرمانەکانی ئەو دڵیان ڕاگرتووە ئەوانە بەدڵێکی سەلامەت دەگەڕێنەوە بۆلای خودای خۆیان و یەکێکن لەبەختەوەریترینەکانی ئەهلی بەهەشت. باهەوڵ بدەین دڵمان جوان بکەین و کەمتر بەدیار ڕوخسارمانەوەبین ، لەجیاتی ئەوەی سێبەر لەبەردەم ئاوێنەکانمان دروست کەین باسێبەر لەسەر کتێبەکانمان دروست کەین بۆڕازاندنەوەی دڵەکانمان.

**دەیەم:** خودای پەروەردگار لەچەندین شوێندا لەقورئانی پیرۆز باسی یارمەتی دانی هەژارانی کردووە بەتایبەت هەتیوان،وەیاسایەکی داناوە بەشێوەك ڕزق و ڕۆزی دابەش کردووە کە بەشێکی زیاتری بەهەندێك بەخشیوەو کەمتربەهەندێکی تر تاوەکو ئەوانەی بەشیان لەوانی تر زیاترە دەستی ئەوانی تری پێ بگرن،هەروەکو پێشەوا (علی کوڕی ابوتالب)خوالێی ڕازی بێت،دەفەرمووێ:(خودای پەروەردگار ئەوەندەی بەسەر دەوڵەمەندەکان دا فەرز کردووە کە هەژاری نەمێنێت و برسیەتی لەناوبچێت).بۆیە ئەگەر کەسێك بەتایبەتی ئەوانەی کە هەبوودو خواپێداون،دڵیان توند دەبێت و ئاسوودەییان لەبیر دەچێتەوە ئەو کاتە ڕێگە چارەیەکی زۆر ئاسان و باشیان بۆ هەیە ئەویش بەسەر

کردنەوەی هەژاران و بێ نەوایانە،مرۆڤ ئەگەر بۆی بکرێت لەنزیکەوە سەردانی ئەو کەسانە بکات کەباری داراییان باش نیە،فێری ئەوە دەبێت کە هەست بەو خۆشیانە بکات کە خودای گەورە پێی بەخشیوە،بەخشین لەپێناو خودا و دەستگرتنی بینەوایان، جۆرە ئارەمیەك بەدڵ دەبەخشێت ،زۆر جیاواز ترە لە ئارامیەکانی تر کە لەشتی تر بەدەستی دەهێنیت،ئێمە بۆیە باسی نزیك بوونەوەمان کرد لەو کەسانە ، لەبەرئەوەی پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاء...)[1].واتە: چووم بۆ بەهەشت و بینیم زۆربەی ئەهلی بەهەشت هەژارەکانن.بۆیە ئەگەر کەسێك لەئەهلی بەهەشت نزیك بێتەوە هەست بەدڵ خۆشی دەکات چ جای ئەوەی یارمەتیشیان بدات،وەلەلایەکی تر خودای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات بەخشندەبین، وەخوداش بەخشندەترینی بەخشندانە هەروەکو دەفەرمووێ:( وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَحْسُورًا ٢٩ الأسراء).
واتە:دەستەکانت لەگەردنت گرێ مەدە،واتەلەبەر ڕەزیلی و چروکی خۆت وەك باڵ بەستراو مەکە،مەبەست ئەوەیە هەروەکو زنجیر دەستی مرۆڤ دەبەستێ چروکیش هەروا دەستی مرۆڤ دەبەستێ لە بەخشش و هاوکاری لێقەوماوان،وەتەواویش دەستەکانت پان مەکەوە تا هەرچیت هەیە بیرێژی بۆ خۆت و بۆ خەڵك،ئەوسا ئیتر بەلۆمەکراویی و حەسرەتەوە بۆ خۆت دادەنیشی،چونکە هیچت لانەماوە.بەڵێ دەبێ مرۆڤ بزانێ لەگەڵ ماڵ وسامان دا چۆن هەڵسوکەوت دەکات،نابێ هەرچی هەیە مقڵی بکاتەوە،ناشبێ چرووك و پیسکەش بێت،دەبێ میان ڕەوانە بجوڵێتەوە.ئەمەیە بەنامەی نێردراوی پەروەردگار کە بەچ ئەندازەیەکی ڕێك و پێك فەرمانی کردووە بەبەندەکانی تالەو بەشە ببەخشن کە پێیانی بەخشیوە،بۆیە ئەگەر تاوەکو ئێستا هەژارانت لەبیرکردووە ئەوە بەخۆت دابچۆرەوە و

---

١ ـ متفق عليه.

مانگی یەك کاتژمێریش بێت تەرخانی بکە بۆ لێقەوماوان و هەژاران،ڕەنگە بڵێی من حاڵم باشە بەڵام تەنیا بەشی خۆم دەکات و قوتی کەسێکی ترم پێ نادرێت،بۆوەڵامی ئەم قسەیەت ئەچینە خزمەت ئەم پیاوە چاکە بزانین چۆن هەژارانی بەسەر کردۆتەوە لەحاڵەتێکدا کەخاوەنی هیچ نەبوو بێجگە لەدڵێك کە هەموو مرۆڤایەتی جێگەی ئەبێتەوە تێیدا،ئەویش لەنموونەی پیاو چاك(بشير الحافی)کە ڕۆژێکیان هەندێك لەهاوڕێیەکانی لەکەشێکی زۆر سەرماوسارد دا هاتنە خزمەتی،کاتێك چونە ژوورەوە دەبینن واجلەکانی لەبەر کردووەتەوەو لەسەرما هەڵدەلەرزێ،وتیان: ئەوەچیە ئەی (ابانصر)؟ فەرمووی: سەرما و سۆڵی هەژارەکانم بیرکەوتەوە،هیچیشم نەبوو یارمەتیان بدەم و دڵنەواییانی پێ بکەم،جابۆیە حەزم کرد بەخۆ سەرما کردن یارمەتیان بدەم و بەژداری سەرماکەیان بکەم. بەڵێ ئازیزان بەو شێوەیە هاوکاری هەژاران دەکرێت کە ئەم بەسەرهاتە بچوکە وەڵامێکی پڕ بەپێستە بۆئەو کەسانەی بەڕادەی پێویست لەدەستیان نیە تایارمەتی کەم دەرامەتانی پێ بدەن،مرۆڤ کە دڵی ناناسودەیە لەوکاتەدا بیرلەوە بکاتەوە کە دەستی کەسێکی نەدارو هەژار بگرێت ئەوکاتە یەکێك لەباشترین دەرمانەکانی هەڵبژاردووە بۆچارەسەر کردنی دڵی خەمباری ،وەکە هەڵ دەستێت بەو کارە،خودای پەروەردگاریش پێی دەفەرموێت: بەندەکەم لەپێناو من بەخشی کەوایە من لەو بەخشندەترم بۆیە پێی دەبەخشێت چەندان و چەندان زیاتر لەو بڕەی کە ئەو مرۆڤە بەخشیویەتی بەبرایەکی یاخود بەخوشکێکی ئیمانداری،ئەمە هاوکاری کردنی کەسی کەم دەرامەت بەو شێوەیەیە،ئەی ئەبێ یارمەتی دانی منالی بێ باوك و بێ دایك چۆن بێت،بەڕاستی ئەمە بابەتێکی یەکجار تایبەت و هەستیارە وەڕێگەیەکی زۆر سەرکەوتوانەیە بۆ چارەسەرکردنی دڵە ماندووەکان بەهۆی باری گرانی خەم،بۆیە کەمێك ئەچینە خزمەت پێغەمبەری ئازیزمانﷺ کە چەندە گرینگی بەوە داوە،تا خەڵکی

یارمەتی هەتیوان بدەن،هەوەکو لەم نمونەدا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە،کە (ابي الدرداء)**بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێ:** (أتى النبي ﷺ رجل يشكو قسوة قلبه ؟ قال: أتحب أن يلين قلبك وتدرك حاجتك؟ ارحم اليتيم وامسح رأسه وأطعمه من طعامك يلن قلبك وتدرك حاجتك)[1] .واتە:جارێك پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستمان و سکاڵای دڵ ڕەقی خۆی کرد،واتا فەرمووی من دڵم ڕەقە چارەم چیە؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: پێت خۆشە دڵت نەرم بێت و بگەی بە پێویستیەکانت؟ بەزەییت بەمناڵی هەتیوو دابێتەوە،وەدەست بەسەریان دابێنە بەنەرمی،وەلەخۆراکت بەشیان بدە،ئینجا دڵت نەرم دەبێت و بەپێداویستیەکانت دەگەی.لەبەرئەوەی مناڵی بێ باوك زۆر بێ نازەو دڵ شکاوە،پێویستی بەکەسێکە شوێنی باوکی بۆبگرێت و ئەوسۆزەی پێ ببەخشێت،وە هۆکارێکی تر کە دڵ دانەوەی مناڵی بێ باوك دڵی نەرم دەکات ئەویش بەدەست هێنانی پاداشتێکی زۆر و بەزەیی خودای پەروەردگارە بۆ ئەو کەسە،بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمووی: (من وضع يده على رأس يتيم رحمة، كتب الله له بكل شعرة مدت على يده حسنة)[1] .واتە: هەرکەسێك دەست بهێنێت بەسەر هەتیوێك دا بەبەزەیی و سۆزەوە، ئەوا خودای گەورە بەقەت هەر تاڵە پرچێکی سەری ئەومناڵە کە دەستی پێ داهێناوە چاکەیەکی بۆ دەنوسێت.

ئەمەیە سۆزوبەزەیی خودای پەروەردگار بەرامبەر بەبەندەکانی لەوکاتەی کە بەزەییان دەبێت بۆمناڵێکی بێ ناز،ئێمەش چەندە بێ ئاگاین و هەرتەنیا بیرلەوە دەکەینەوە کە بۆچی شتێکمان بۆنەبووە یاخود ئەوسامانەی کە هەمانە زیاترنیە لە کەسێکی تر

---

١ ـ رواه الطبراني.

ـ رواه الإمام أحمد.

لەکاتێك دا کە بەو بەشەی خۆمان ڕازی نین،ئەم بەشەش خەونی چەندان کەسی ترەکە وەکو ئێمە بێت،وەشتێکی تر هەیە کەپێم خۆشە ئەلێرەدا بیخەمە ڕوو، سەرەتا بەپرسیارێك دەست پێ دەکەین،ئایا تۆ ئێستا پێت بڵێین پێت خۆشە لەو دونیا لەنزیك پێغەمبەری ئازیزمانﷺبیت لەبەهەشتا؟بێگومان لەوەڵامدا دەڵێی بەڵێ، لەهەمان کاتیشدا،هەوڵی بۆ نادەیت و ڕەنگە بەخەیاڵیشت دانەیەت کە بگەی بەو پلەیە،بەڵام پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ڕێگە چارەیەکی زۆر سادەو ئاسانی بۆمان دیاری کردووە کە بتوانین بگەین بەو پلەیە،وەکو ئاماژەی بۆ کردووە و دەفەرمووێ: (أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ ، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَلِيلًا)[1].

واتە: من وئەو کەسەی کەکەفیلی منالێکی هەتیوودەکات ئاواین لە بەهەشتا، ئاماژەی بەدوو پەنجەی پیرۆزی کرد،وەنێوانی پەنجەکانی بۆشایی کەم بوو. واتە ئەو کەسەی کە هەتیووێك بەخێو دەکات یاخود بەردەوام چاکەیان لەگەڵ دەکات و نایەڵێت موحتاجی هیچ کەسێك بن،ئەوا لەبەهەشتا لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزمان ﷺبەیەکەوەن و زۆر لەیەك نزیکن بەڕادەی ئەو بۆشاییەی کە پێغەمبەرمانﷺ ئاماژەی بۆکردووە،

سبحانالله! ڕێگەیەکی چەندە ئاسان و ئەجروپاداشتێکی ئەوەندە زۆر،ئەبێ چ شتێك ڕێگر بوو بێ کە نەی کەی،وە ئەم هەواڵە خۆشەی کە پێغەمبەرمان ﷺ پێمانی ڕاگەیاندووە چەندە دڵخۆش کەرو خەم مرێنە ،ئەگەر بێت و ئەنجامی بدەین لەگەڵ کێ ئەبین لەفیردەوسا! بۆیە بەڕاستی نابێت مرۆڤی باوەڕدار لەو پاداشتە لەبن نەهاتووە خۆی لابدات و نەی کات،تاوەکو بگات بەو پلەیەی کە خودای پەروەردگار بەهۆی ئەو

١ – أخرجه احمد جلدي(٥)لاثترة(٣٣٣) حةديثي(٢٣٢٠٨) (البخاري)جلدي ٧ لاثةرة( ٦٨ ).

کارەیەوە دڵی نەرم و پڕ لە نوور بکات بۆئەوەی لە گێژاوی خەم دا بەسەلامەتی بێتە دەر.بەوشێوەیە دەتوانین دڵ خۆشی خۆت بەدەست بهێنیت لەیارمەتی دانی خەڵکی نەداروهەژاروهەتیوان،وە بەردەوام لەسەر ئەو کارەبیت و جێبەجێی بکەیت ،ئەگەر لەتواناشت دانیە هەرنەبێت ساتێك وەکو ئەوان بژی تاهەست بەمەعاناتیان بکەیت، ئەگەر هەر ناشتوانی ئەوا خۆت بەدوور بگرە لەوەی کەم سەیریان بکەیت یان خوانەکردەگاڵتەیان پێ بکەیت،تا لە سزای بەئێشی پەروەردگار بەدوور بیت بۆیە دەڵێین:

هەژارێکت دیــت ڕومەکە بەولا

ڕێزی زیاترە لە دونیـــــای ئەو لا

گەر بەدەستی بێ خۆی ئەنەخشێنێ جوان

بــــەڵام قــــەدەرە پێـــــی ئــــەچێژێ ژان

دووری مەبینە کەوا تۆش. وابی

ڕەنگە نزم بیت ئەگەر تۆ شابی

سوپاس گوزاری لەهەمــوو بارێکا

جوانــی دەرونت ڕێك پۆش دەر ئەخا.[1]

---

١ – (نوسەر)لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی یەکەم.

**یانزەهەم:** مرۆڤ بۆئەوەی زیاتر و زیاتر بەدووربێت لەکێشەو گیروگرفت پێویستە قسە نەشتێك دا نەكات كەپەیوەندی بەئەوەوە نیە،چونكە ئەگەر كەسێك بەبێ ئەوەی داوای لێ بكرێت كەڕای خۆی بدات،بەجواب هاتوو ڕای دا ئەوا جاری واهەیە توشی ڕووشكێنی دەبێت،ئەمەش وای لێ دەكات كەدڵی بشكێت و سەرئەنجام ڕایەكی لێ وەرناگیرێت،مرۆڤ لەوكاتەدا خاوەنی هەیبەتی خۆیەتی كەلەو بابەتەدا قسەنەكات كەداوای لێنەكراوە، بەجواب هاتن لەسەر شتێك كەپەیوەندی بەتۆوە نیە وەكو نەوە وایە نان دەرخواردی كەسێك بدەیت و خۆت بتەوێت تیربیت ئەمەش هیچ ئامانجێكی نابێت،بۆیە(مالیكی كوڕی دینار) دەفەرمووێ: (ئەگەر قەسوەت و دڵ ڕەقیت بینی لەخۆت یان خۆشەویستی دونیا نەویستی مردن،یان بێ بەشی لەڕزق و ڕۆزی ئەوا بزانە كە قسەت لە شتێكدا دەكەیت كەپەیوەندی بەتۆوە نەبێت)،دروست وایە ئەوەندەی لەسەرمان ڕێگەمان پێدراوە بدوێین و زێ دەرەوی تێدا نەكەین تاوەكو لەوەبەدوور بین كەپێمان بوترێ بەس یاخود پێویست بەوەندە قەسەناكات وەلە پەندێكی جوان دا هاتووە دەڵێت:(مرۆڤی ژیر دەمی دادەخات پێش ئەوەی خەڵكی گوێیان داخەن وە گوێی دەكاتەوە پێش ئەوەی خەڵكی دەمیان بكەنەوە)،وە زمان یەكەو گوێ دوانە قسەیەك بكەو دووان بزانە،زمان دەبێت ئەوەندە بەكاربهێنرێت كەپێویستە،نەوەكو ئەوەندەبێت كە گوێچكەكان دابخات و هیچی تر گوێی بۆناگیرێت،وە پێغەمبەرمانﷺ پێمان دەفەرمووێ: (**من كان يؤمن بالله واليوم الآخر، فليقل خيرًا أو ليصمت**)[1].واتە: ئەو كەسەی كە باوەڕی بەخودا و بەڕۆژی دوایی هەیە باقسەیەكی چاك بكات یاخود با بێ دەنگ بێت.

ئەمە پێوەرێكە بۆ كێشانی ئەو هەموو قسانەی كە دەیكەین و ئاگامان لێی نیە،تا ئاگامان لێی بێت وەبەپێی پێویست زمانمان بجوڵێت، تاوەكو دڵەمان بەدوور بێت لە ڕەق

---

١ ـ متفق عليه.

بوون و نائاسوودەیی،وە لە فەرمووودەیەکی تردا پێغەمبەرمانﷺ ئاگەدارمان دەکاتەوە لەهۆکارێك کە دڵەکان بەرەو ڕەق بوون دەبات و ئاسودەیی لێ ون دەکات کە دەفەرمووێ: (لاَ تُكْثِرِ الضَّحِكَ ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ)[1].واتە:زۆر زیاد پێمەکەنە،چونکە زۆر پێکەنینی زیادە دەبێتە هۆی مراندی دڵ.بەڵام لای مامناوەندی بگرە وەك پێغەمبەرمانﷺ پێمان دەفەرمووێ: (تَبَسُّمُك فِي وَجْه أَخِيك لك صدقة)[2].واتە: خەندە و بزەی لێوانت لەڕووی براکەت چاکەکردنە لەگەڵی.بۆیە پێکەنینش سنووری دیاری کراوی خۆی هەیە کە ئەگەر لەو سنورە تێ بپەڕی دڵ دووچاری مران و خاڵی بوون دەبێت لە خۆشی و شادی و وا لەمرۆڤ دەکات ئەگەر بابەتێك پەیوەندی بە ئەویشەوە نەبێت تێیدا قسە بکات و بەرەو عاقاری نەزانی بکەوێتە ڕێ.

**دوانزەهەم**: یەکێکی تر لەو ڕێگایانەی کە مرۆڤ دەتوانێت بگرێتە بەر بۆچارەسەرکردنی خەموو پەژارەکانی دڵی ئەویش،ئەوەیە هاوڕێیەتی کەسانێك بکات کە لەخۆی وشیارتر وداناترو بەتەقواتربێت،لەبەرئەوەی هاوڕێی ئیمان دار وەکو گوڵێکی بۆن خۆش وایە کەهەرکاتێك ناخت پڕبوو لەخەم پەژارە بۆساتێك بچیە لای و بەبۆنێکی ئەوکەلەلای هەڵی ئەمژیت یەکسەر خەم و خەفەتەکەت بڕەوێتەوەو تاڕادەیەك لەبیریت نامێنێت،ئەم هاوڕێیانە دۆزینەوەیان ئاسان نیە وە نەدۆزینەوەشیان ئەوەندە گران نیە،

ئەتوانیت بەهۆی پلەی بیروباوەڕتەوە بیان دۆزیتەوە و لەخزمەتیان دابیت،هاوڕێی خەم ڕەوێنەرەوە ئەو هاوڕێیەیە کەهەر لەگەڵ بینینی دا خەمەکانت لەبیر ئەباتەوە پێش ئەوەی باسی بکەیت،

---

١ – رواه (ابوداود).
٢ - رواه الترمذي.

وەمرۆڤ بەچ شێوەیەك دەتوانێت ببێتە خاوەنی زۆرترین هاوڕێی وا، ئەویش بەهۆی نیەت صافی و دڵ بێ خەوشی خۆیەتی بەرامبەر دەوروبەرەکەی،وەمرۆڤی نیەت صاف هەمیشە دەبێتە خاوەنی هاوڕێیەکی راستەقینە کەبەژداری دەکات لەخەمەکانی و لەکێشە و گرفتەکانی، هەرکەسێك مەصلەحەتی وەلاناو بەبێ نیاز تەنیا لەپێناو خودای پەروەردگار رێزی لەکەسێك ناو خۆشی ویست ،ئەوکاتە زۆر بەدەگمەن توشی هاوڕێی مەصلەحەتچی دەبێت و بەدوور دەبێت لەو کێشەو نارەحەتیانەی کەبەسەری دەهێنێت،

ئەو دوو کەسەی کەلەپێناو خودا یەکتریان خۆش دەوێت،خودای پەروەردگار کلیلی لابەری خەمەکانیان لەلای یەکتر دادەنێت، بۆیە هەرکەیەکتر ئەبینن خەمەکانی دڵیان ئەبێ بەسەراب و ونی دەکەن،وەلەدوارۆژیشدا بەهۆی ئەم خۆشەویستیە پاك و بێ نیازە،یەکێك لەپلە باشەکانیان لەلای پەروەردگار بۆ دانراوە کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺمژدەی ئەم هەواڵە خۆشەمان پێدەدات و دەفەرمووێ: (إن الله يقول يوم القيامة: أين المتحابون بجلالي ؟ اليوم أظلهم في ظلي يوم لا ظل إلا ظلي)[1].

واتە: لەرۆژی دوایی دا خودای پەروەردگار دەفەرمووێ: کوا ئەو کەسانەی کەلەپێناو خودا یەکتریان خۆشدەویست؟ لەم رۆژەدا دەیان خەمە ژێر سێبەری خۆم،بێجگە لە سێبەری خۆم هیچ سێبەرێکی تر نیە.ئەم مژدەیە تایبەت کراوە بەو کەسانەی لەگەڵ یەکترن بەبێ بەرامبەر و لەپێناو خودا،بۆیە هەرکاتێك مەیلت لێ بوو کەسێك ببێتە هاوبەشی خەمەکانت و بۆت کەم بکاتەوە، دەبێت نیەتی خۆت پاك بکەیتەوە لەهەر خەوشێك کە تێکەڵی بووە،

---

١ – رواه مسلم.

بۆیه تابۆت دەکرێت لەخزمەتی کەسانی بەئەزموونتربە بۆئەوەی ئەزموو پەیابکەی لەسەر ئەو کێشانەی کەڕووبەڕووت ئەبنەوە لەو گەشتەکەمەی ژیانت.

وەلەچەندێرێك دا دەنگ هەڵدەبرێن و دەڵێین:

**هاوڕێیەك هەڵ بژێرە لە ژیانی دوونیا**

**هاوەڵـــــی تۆ بـێ لە شادی و خەما**

**گەر رۆژێك ویستت خراپە بکـــەی**

**ڕێگەت پێ بگرێ پێت بڵێ نەکەی**

**نەوەك هاوڕێیەك هەر بۆ وەختی بـــێ**

**تەنها بۆ خۆشی و دۆستی سینیت بێ.**[1]

---

[1] - (نوسـەر)لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی یەکەم.

**سیانزەهەم:** هەروەکو لەبەشی هۆکارەکاندا ئاماژەمان بە هۆکارێك کرد کەبەرهەم هێنەری خەم و لەناوبەری دڵ ئاسودەییە،ئەویش هەڵگرتنی ڕق و کینە لەدڵ و توڕەبوونی بەردەوامە،بۆیە ئەلێرەدا دەستنیشانی چەند چارەسەرێك دەکەین بۆ چارەسەرکردنی ئەو خەشم و توڕەییە،پێش هەموو شتێك مرۆڤ ئەگەر بزانێت لەکاتی توڕەبوون دا شەیتان چۆن گاڵتە پێ دەکات ئەوکاتە هەریگیس ناهێڵێت توڕەییەکەی بەسەری دا زاڵ بێت، لەبەرئەوەی شەیتان لەدووکاتدا توانای هەیە بەسەر مرۆڤ دا زاڵ بێت لەکاتی توڕەیی داو لەکاتی سەرمەستی دا،کەبەویستی خۆی یاری پێ دەکات و بەرەو ئەنجامدانی تاوانی تاوانی دەبات، مرۆڤی بەتوانا کەسێکە کەتوانای بەسەر توڕەیی خۆیدا هەیە کۆنترۆڵی کردووە،ونایەڵێت بەهۆی توڕەییەکەیەوە کاری هەڵەی لەدەست دەربچێت، وە پێغەمبەرمانﷺ سەبارەت بەوکەسانە فەرموویەتی : (ليس الشديد بالصرعة ، إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب)[1].واتە: ئازایەتی و چاونەترسی بەتوڕەیی نیە،بەڵکو توندی و ئازایی بەوەیەکە بتوانیت دەست بەسەر توڕەییەکەت دابگریت. هەرچەند مرۆڤ کۆنترۆڵی تورەی خۆی بکات ئەوا بەدورتر دەبێت لەکێشەو گێروگرفت و ناخۆشی، وەئەو کەسانەی کەزاڵ بوون بەسەر توڕەیی نەفسیان خودای پەروەردگار وەسفیانی کردووەو پلەیان بەرزە لەبەهەشتا کە دەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ ۗ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ **آل‌عمران**﴾. واتە: پارێزکارە بەهەشتیەکان ئەو کەسانەن کە لە خۆشی و ناخۆشیدا،لە هەبوون و نەبوونیدا ئەوان دارایی دەبەخشن و ڕق و غەزەبی خۆیان لەکاتی توڕەبووندا دەخۆنەوە و کاری پێناکەن و لەخەڵکی دەبوورن و تۆڵە ناسەننەوە ،وە خوای گەورەش خێر خوازانی خۆش دەوێ.

---

١ .رواه أحمد (٢٣٦/٢)والحديث متفق عليه .

ئەوکەسانە بەوشێوەیە خودای پەروەردگار باسیان دەکات،ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٚ کە خودای پەروەردگار ئەم سیفەتەی بەلاوە خۆشەویستەو دەویەوێت ئێمە لێمان بێتە جیٚ، مرۆڤی باوەڕدار ئەوکاتەی کە دڵی خاڵی دەکات لەڕق و کینە ئەوکاتەی بەلاوە خۆشترین کاتە و دڵی پێی ئارام دەگرێت،هەروەها بەو کارەی لێخۆش بوونی پەروەردگاری بەدەست دەهێنێت،هەر لەم تەوەرەدا بەسەرهاتێکی بچووك دەهێنینەوە ئەویش (زەید کوڕی اسلم)بۆمان دەگێرێتەوە و دەفەرمووێ: (چەند پیاوێك چوونە لای (ابو دوجانە)کە نەخۆش بوو، بینیان ڕوخساری زۆر جوان و نورانی بوو لەدوورەوە دەدرەوشایەوە، بۆیە پێیان گوت:هۆکاری چیە ڕوخسارت ئەوها دەدرەوشێتەوە؟ فەرمووی: هەرکردارێکم ئەنجام دا بێت ئەوها متمانەم پیٚ نەکردووە وەك ئەوەی کەمتمانەم بە دوو شت کردووە، یەکەمیان: هەرگیس قسەم نەکردووە لەبارەی شتێك کەپەیوەندی بەمنەوە نەبیٚ،دووەم: دڵم هەردەم بەرامبەر بەموسوڵمانان پاك و بێگەرد بووە و هیچ کات ڕق و کینە و غەشم لەدڵدا نەبووە بەرامبەر هیچ کەسێك)[1] .

ئەمە بەرهەمی هەڵ نەگرتنی ڕق و کینەیە لە دڵ دا کە دڵ بەنووری سۆز ڕۆشن دەکاتەوە بگرە ڕوخساریش،وەجۆریکی تری مرۆڤ هەیە جارجارە دەتوانێت کۆنترۆڵی توڕەیی خۆی بکات بەڵام جاری واش هەیە لەدەستی دانیە، ئەم هەموو گەرم بوونە بەهۆی توڕەییەوە سەرچاوەی گرتووە بۆیە ئەگەر ئەو کەسە بەئیرادەوە بیەوێت چارەی خۆی بکات تادڵی بەردەوام لەئارامی دابێت و لەئاسودەیی دانەبڕێت،ئەوا پێویستە گویٚ بۆ ئەم فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ شل بکات کە چۆن چارەسەری بۆ داناوە و دەفەرمویٚ: (إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ ، وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ ، وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ ،

---

١ ـ صحيح الوصايا الرسول المجموعة الثانية، بەرگی ٢ لاپەڕە (١١٠).نوسینی(سعد یوسف ابو عزیز).

فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ)[1].واتە: تورەیی لەشەیتانە،وەشەیتانیش لە ئاگردروست کراوە،وە ئاگریش بەئاو دەکوژێتەوە،ئەگەر کەشێك لەئێوە تورەبوو بادەست نوێژێك بشوات.تاوەکو تورەییەکەی کەم بێتەوەو نەمێتەوە،چونکە تورەبوون پەستانی خوێن بەرز دەکاتەوە و لەش گەرم دادێنێت،لەوکاتەدا باشترین کار کە بکرێ،هەڵگرتنی دەستنوێژە، ڕەنگە ئەم ڕێگایە بەلای زۆربەمانەوە ئەستەم بێت و پرسیار بکەین بڵێین مرۆڤ چۆن لەکاتی تورەییدا ئیرادەی ئەوەی هەیە کە دەست نوێژ هەڵبگرێت بەڕاستی ئەمە کارێکی ئەستەمە!،نەخێر ئەستەم نیە بەڵکو ئەگەر ئیرادەیەکی تاڕادەیەك باشت هەبێت ئەوکارە ئاسانە،وە ئەگەر ئیرادەشت نەبێت، ڕێگەیەکی ئاسانتر هەیە بۆئەو کەسانەی کەتورە بوونەکەیان لەسنور بەدەرە ئەو ڕێگە چارەیەش پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ باسی کردووەو دەفەرمووێ: (إذا غضب أحدكم وهو قائم فليجلس ، فإن ذهب عنه الغضب وإلا فليضطجع)[2].واتە:ئەگەر یەکێك لە ئێوە تورەبوو بادابنیشێت،ئەگەر هەر نەڕۆیشت تورەییەکەی با پاڵ بداتەوە،ئەمەش زیاتر بۆئەوەیە لەوکاتەی کە مرۆڤ توورە دەبێت ئەگەر بەپێوەوە وەستابوو ئەگەری کەوتنەوەی شەڕ و دەست وەشانی لێ دەکرێت،بۆیە دابنیشێت باشترە چونکە لەدانیشتن مرۆڤ توانای کەمتر دەبێت بۆ شەڕو دەست وەشاندن وە بەپاڵدانەوە کەمتر، بۆیە ئەم چارەسەرەی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺزۆر بەسادەیی براندوویەتیەوە بۆ لەناو بردنی تورەیی،تاوەکو بەدووربین لەکێشەنانەوە و لەناوچونی خۆشی لەدڵماندا،نابێت لەوە بێخەبەر بین کەشەیتان بەردەوام لەکەمیندایە بۆمان تاوەکو توشی شەرمەندەیی دونیاو قیامەتمان بکات،بۆیە دەبێت ڕێگەی لێ بگرین و جڵەوی نەفسی خۆمانی نەخەینە بەردەست بەهۆی تورەبوونەوە.

---

١ ـ أخرجه أحمد ٤/ ٢٢٦ (١٨١٤٨) . وأبو داود(٤٧٨٤).
٢ ـ في مسند أحمد(١٥٢/٥)وانظر صحيح الجامع رقم (٦٩٤).

**چواردەهەم:** ئێمە زۆرجار باس لەچارەسەری هەندێك كێشە دەكەین كە بەرۆكی پێ گرتوین بەڵام توانامان نیە یاخود ئیرادەیٚ بەردەوامی مان نیە لەسەر بەكارهێنانی ئەو چارەسەرانە تاوەكو هەست بكەین كە شتێكمان گۆڕیوە،بۆیە جاری واهەیە هیچ چارەسەرێكیش كارمان تیٚ ناكات و دەبیٚ خۆمان چارەسەر دروست بكەین و بەكاری بهێنین،لەبەرئەوەی مرۆڤی سەركەوتوو هەرگیس كۆڵ نادات لەهەوڵەكانی بۆگیشتن بەئامانجە سەرەكیەكانی،ئەو چارەسەرەش سوجدە بردنە بۆ زاتێك كە هەموو كەون و ئەوەی لەناوی دا هەیە سوجدەی بۆ دەبەن،تەنها مرۆڤی غافلٚ نەبێت،زۆرمانەوە لەسوجدە بەتایبەتی لەدرەنگانی شەودا دەستكەوتێكی لەبین نەهاتووە كە مرۆڤەكان بەكەمی پێی دەگەن،و رێگە چارەیەكی یەكجار سەركەوتووە كە دڵەكانی پیٚ سارێژ دەكرێت و پڕنووری ئیمان و ئیحسانی دەكات.زۆرمانەوە لەسوجدەداو دوعاكردن تیایدا چەندین دەست كەوت بەمرۆڤ دەبەخشێت،پێش هەموو شتێك خودای پەروەردگار پێمان دەفەرمووێ: (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾ غافر).واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لەمن بكەن و لەمن بپاڕێنەوە،منیش وەڵامتان دەدەمەوە،وەچاكترین داواش كە لەخودا داوای بكەی ئەو داوایەیە كە لەسوجدەدا دەیكەت،وەپێغەمبەری ئازیزمان دەفەرمووێ:ئێوە ئەگەر بتان زانیایە سوجدە چ پاداشتێكی هەیە ئەوا لەسوجدەدا هەڵ نەدەستانەوە،ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوجدە لەلای پەروەردگار زۆر خۆشەویستە،وەهەركەسێكیش ئەنجامی بدات و بەردەوام بێت لەسەری خودای باڵادەستیش دڵی دامەزراودەكات لەسەر بەنامە پیرۆزەكەی خۆی،ئێمە ئەگەر بڕوانین لەو كەونە،بۆمان ڕون دەبێتەوە كە هەرچی لەئاسمانەكان و زەوی داهەیە جگە لەمرۆڤ و جن،بەبەردەوام لەسوجدەدان بۆ پەروەردگار هەروەكو دەفەرمووێت: (وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿١٥﴾

الرعد).واتە: هەموو ئەوانەی کەلەئاسمانەکان و زەوی دان،تەنانەتی سێبەرەکانیشیان بیانەوێ یاخود نەیانەوێ بەیانیان و ئێواران سەرجەم ئەمانە گشتیان سوجدە بۆخودا دەبەن،بەبێ دابڕان و غافڵ بوون و سەرپێچی کردن.ئەوەی وەستاوە تەنها مرۆڤی بێ ئاگایە لەیادکردن و پەرستشی پەروەردگار،یەکێك لەسەیروسەمەرەکانی سوجدە ئەوەیە تۆ سەرت لەنزم ترین شوێن دا دەنێیت و داوا لەزاتێك دەکەیت کەلەبەرزترین شوێن دایە،ئەچرپێنیتە گوێی زەوی و لەئاسمانەوە وەڵامت ئەدرێتەوە،ملکەچی بۆ پەروەردگارت ئەنوێنی و خوداش سەربەرزت دەکات لەناو خەڵکی دا،وەدەتکات بەخاوەنی هەیبەت و عیززەتی خۆت،کە ئەو ڕێژەیەش بەئاشکرا هەستی پێ دەکرێت،هەربۆیە بەردەوام فەرمانی پێمان کردووە و پەروەردگار دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾الحج).واتە: ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە بەخودای گەورە! بچەمێنەوەوکڕنووش و سوژدەی بۆ بەرن،واتە: بەتێروتەسەلی هەردەم نوێژەکانتان بکەن،وەتەنها پەروەردگارتان بپەرستن و کەسێکی تر مەکەنەسەروەرتان،وە تادەشتوانن هەرکاری خێر و چاکە بکەن،بالەخوا نزیك ببنەوە،بەشکو لەدنیاو لەقیامەت دا ڕزگارو سەرفرازو بەختیار بن،لەم ئایەتەوە ئەوەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە کە بەندە بەسوجدە بردن و مانەوە تیایدا،لەخودای خۆی نزیك دەبێتەوە،وە لاتان مەعلومە ئەوەی لە پەروەردگاری خۆی نزیك بێتەوە ئاسودەو کامەرانی پێ خەڵات دەکرێت.

ئەوکەسانەی کەتام و چێژی سوجدەبردنیان کردووە بەردەوام ملکەچی خۆیان بۆ پەروەردگاریان پیشان دەدەن و بەدوورن لەلوت بەرزی و خۆبەگەورە زانین و پەروەردگاریش وەسفیان دەکات و ناوێکی زۆر بەرزیان لێ دەنێت،وەکو دەفەرموێت:

(وَعِبَادُ الرَّحْمنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾الفرقان).واته بەندەڕاستەكانی خودای بەبەزەیی ئەوانەن كە زۆر بەسەلاریی و بەنەرمی و لەسەرخۆیی و بێ دەعیە و فیز بەسەرزەویدا دەڕۆنە ڕێوە،وەهەركاتێكیش نەزانەكان لەڕوویان دەوەستن سەلامیان لێ دەكەن و بەقسەی چاك و باش وەڵامیان دەدەنەوە،وە ئەو كەسانەكێن ؟!،كەسانێكن كە پەروەردەی سوجدەكانیانن،وە خودای پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ الفرقان).واتە: ئەوانەن كەشەوگار بەنوێژكردن و سوجدەبردن و بەپێوە وەستان دەبەنە سەر.ئەو كەسانە پاداشتێك بۆ خۆیان مسۆگەر دەكەن كە لەهیچ شوێنێكی تر بەدەست نایەت،ئەبێ مرۆڤ پێوەرێك بۆخۆی دابنێیت،ئەویش هەر شتێك لە پەروەردگار نزیك بكاتەوە ئەوە بەختەوەری لێوە دەست دەكەوێت،سوجدەبردنیش ڕێگەیەكی زۆر باشە بۆزیاتر نزیك بوونەوە لە خودای بەخشندە،وەسوجدە بردن و مانەوە تیایدا پەیوەندیەكی توند و تۆڵ دروست دەكات لەنێوان بەندەو پەروەردگاری،جابۆیە ئەگەر تاكو ئێستا ئەم كارەت نەكردووە،هەوڵدە ئەنجامی بدەیت ،بەتایبەتی لەشەودا لەسوجدەكانت زۆربمێنەوەو داواكانت بچرپێنە بەزەوی داو دڵنیابە لەبەرزترین شوێن گوێ بیستی ئەم نزاو پاڕانەوەیەتە پەروەردگارت،بەڵام نابێت ئەوەت لەیاد بچێت سوجدە بردن پێویستی بەخشوع و ملكەچیە،نەك تەنیا سەردانان لەسەر زەوی،پێویستە دڵ ئامادەبێت لەو كاتە هەستیارە،وە ئەو كەسانەی كەبەردەوامن لەو كارە،لەقەلەقی و دڵە ڕاوكێ و دوودڵی ڕزگاریان دەبێت وەهەمیشە بیریان لەلای خۆیانە و بەكەمی خەیاڵی بێ سود دایان دەگرێت،وە خاوەنی زاكیرەیەكی زۆرباش و شتیان لەبیرناچێتەوە بەكەمی نەبێت، ئەمانەش هەموو لەفەزڵ و گەورەیی و بەخشندەیی پەروەردگارەوەیە بۆ بەندە صالحەكانی، بۆیە پێویستە لەبیرت نەچێتەوە كە سوجدەكانت بۆ خودای بەخشندە بێ

ئاکام نابێت، وەدەبیتە خاوەن دڵێکی ئارام و پڕ لەهیوا،وە هەرکاتێکیش خەم و ئاسودەیی بۆت هاتوو زیادی کرد،ئەوا تۆش زیاتر لەسوجدەکانت بمێنەوە و داواکانت بکە،دڵنیاش بە کە وەڵامت ئەدرێتەوە،ئەمەش ڕێگە چارەیەکی هەستیارە کە بەرێژەی زۆر لەمرۆڤەکان لەبەرنەبوونی ئیرادە ئەنجامی نادەنوو پشت گوێیان خستووە،وەوتراوە:

## سەرێك بەئیخلاص بچێتە سوجدە

## لەلای پەروەردگار بەڕێز و مەردە.[1]

**پانزەهەم:** لەپاش باس کردنی چەندین چارەسەری مەنتقی کۆتایی پێ دەهێنین بەم خاڵە،وە بۆیە لەکۆتا خاڵدامان ناوە لەبەرئەوەی مرۆڤ ئەگەر بێت و ئەو چارەسەرانەی کە لەپێشترا لێوەی دواوین جێبەجێی بکات بەباشی ئەوکاتە دەگات بەو توانایەی کە ئەم چارەسەرەش بەکاربهێنێت،وەبەهۆی ئەوەی دڵەکانمان نەرموو نیانیان لەدەست داوەو ڕەق بوونێکی سەیری بەسەر داهاتووە بۆیە ناتوانین ئەو چارەسەرە بەئاسانی جێبەجێ بکەین ئەگەر بێت و ئەوانەی پێشوو بەکارنەهێنین وەکو ئامادەکاریەك و ڕاهاتنێکی باش لەسەر چارەسەر کردنی کێشەو گرفتەکانمان، ئەو چارەسەرەش کە باسی دەکەین ئەوەیە،ئەگەر مرۆڤ بتوانێت لەپێناو خوداو لەترسی سزای ئەو، فرمێسك بەچاوانی دابێتە خوارەوە و چاوی ببێتە حەوزی مەلەکردنی دڵۆپە فرمێسکەکان،گریان هەستێکە دروست دەبێت بەهۆی کاریگەری پەستانێك کە دڵ دووچاری دەبێتەوە،بۆیە دڵ نامە دەنێرێت بۆ چاو و ئەو ئاوە هەڵ دەقوڵێت،پاش تەواو بوونی دەردانی ئەم ئاوە،دڵ ئارام دەبێتەوە و هەست بەئارامی و ئاسودەیی دەکات،وە لەم سەردەمە بەهۆی جەنجاڵی دونیا،و زۆری گوناه و تاوان کردن دڵەکانمان ڕەق بوون و نەمیان لەدەست داوە بۆیە زۆر بەکەمی هەست بەنەرم

---

[1] – نوسەر.

و نیانی دڵەکانمان دەکەین و بەئەستەم فرمێسك لە چاوانمان دێتە خوارەوە، بەهۆی ئەوەی پشتمان لەبەرنامە پیرۆزەکەی خودای گەورە کردووە و بەخەیاڵمانا نایە بیرلەو حیکمەتانە بکەینەوە کە پەروەردگار بۆمانی ڕام کردووە،بەدەر لەمانەش ئەگەر کەسێك ببینین بگریێت لەترسی خودا لەلامان سەیرە بگرە جاری واش هەیە لەدڵمانەوە گاڵتەمان پێی دێ نازانین کە ئێمەش پێویستە لەسەرمان بەو شێوەیە بین، بۆیە خودای باڵادەست بەبیرمان دەهێنێتەوە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا،و دەفەرمووێ: (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ ﴿١٦﴾ **الحديد**).واتە: ئایا کاتی ئەوە نزیك نەبۆتەوە بۆئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵەکانیان نەرم بێ بۆ یادی خودا.ئەمە پەیامێکە زۆر گەورەیە بۆ بڕوا داران کە بەخۆیان دابێنەوە،تاکەی بەو شێوەیە لەئاست بیستنی ئایەتەکانی پەروەردگار دڵمان ڕەق بێت و گوێی بۆنەگرین و دڵمان نەلەرزێت و کارمان تێ نەکات. گریان بەهاری دڵەکانە،ژیانەوەی ئەو مەملەکەتەیە کە لەدڵت دا دروستت کردووەو بەڕێوەی دەبەی،ئەوەش بزانە ئەو کەسەی بتوانێت لەترسی پەروەردگاری بگریێت، ئەوە گەیشتووەتە پلەیەکی ئیمانی بەرز کە هەموو کەسێك پێی ناگات،وەخاوەنی دڵێکە کە خۆی بۆخۆی بەهارێکە لەدڵ و دەرونی دا و هیچ شتێك بێ ئاگای ناکات لەیادکردنەوەی پەروەردگاری،بۆیە دەبێت هەوڵ بدەی بەهۆی ئەو ئیمانەی کە هەتە بگەیت بەپلەی تەقواو بە ڕژانی فرمێسکەکانت لەترسی خودا و فیردەوسی بەرز بەدەست بهێنی،وە بێجگە لەم پاداشتەش پاداشتێکی تر بەدەست دێنی کە پێغەمبەرمانﷺلەبارەی ئەو کەسەی کە لەپێناو خودا فرمێسك بەچاوانیدا دێنە خوارەوە دەفەرمووێ: (ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه...)[1].واتە: یەکێکی دیکە لەو حەوت کەسەی کەلەڕۆژی دواییدا لەبن سێبەری خودا حەشر نەکرێن،ئەو مرۆڤەیە کە

---

١ ـ متفق عليه.

بەنهێنی و لەچۆڵەوانیش دا هەردەم یادی خودا دەکا و چاوەکانی فرمێسکیان پیادێتە خوارەوە،فرمێسك باراندن ئەوەندە خۆشەویستە لەلای پەروەردگار ئەگەر هەرکەسێك ئەنجامی بدات رێگە نادات چاوەکانی ئەزیەتێك ببینن لەرۆژی دوایی دا،

وە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێ: (عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ الله، وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ الله)[1].واتە: دووچاو هەیە ئاگرنایان سوتێنێت،چاوێك بۆ خوداو لەترسی خودا گریابێت،وە چاوێك حەرەسیاتی گرتبێت لەپێناو خودای گەورە.

ئەم دووچاوە ئاگریان لێ قەدەغەکراوە،وەدەبێ ئەو مژدە خۆشەش بزانین کە ئاگری دۆزەخ بەئاوی زەریاو دەریاکان ناکوژێتەوە بەڵام بەفرمێسك دەکوژێتەوە،چەند دڵۆپێك ئاگرێکی ئەوەندە بەتین بکوژێننەوە! ئەی باشە چۆن ناتوانێت خەمەکانی دڵ بکوژێنێتەوە و فێنکی بکاتەوە، جاپێویستە بەپێی توانا خۆمان بۆ ئەو پلەیە رابهێنین و دڵمان دامەزراو بکەین لەسەری تاوەکو بەدڵێکی پڕلە نوور و سەلامەتەوە بەرەو بارەگای خودا بگەڕێینەوە، وە پێویستە ئێمەش بەردەوام وەك پێغەمبەرمانﷺ ئەم دوعایە بکەین کە بەردەوام دەی خوێند، تاوەکو دڵەکانمانی پێ ئاو بدەین هەروەکو دەپاڕایەوەو دەی فەرموو: (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ)[2].واتە: ئەی دامەزرێنەری دڵەکان،

دڵم دامەزرینە لەسەر دینەکەی خۆت.وەلەدوای ئەم دوعایەش ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾ ٨﴿آل‌عمران).واتە: پەروەردگارمان دوای ئەوەی هیدایەتت داین و رێنمایت کردین، دڵەکانمان لەرێی هەقی خۆت لامەدە،تا نەکەوینە شوێنی فیتنە خوازان،وە لەلای

١ – رواه الترمذي وحسنه، وصححه الألباني.
٢ - رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.

خۆتەوە ڕەحمەتمان پێ ببەخشە،دڵمان لەسەر حەق دابمەزرێنە بەڕاستی هەرتۆ بەخشندە و بەخشێنەری هەرە مەزن.

ئەمە بوو فەزڵ و گەورەیی گریان لە پێناو خودای گەورە، کە هەوڵدانی دەوێت بۆ گەیشتن پێی و وە ئێمەش دەڵێین:

چاوێك بۆ خودا دابـــدا لە باران

نوور ئەپرژێنێ لەناوچەی کوڵمان

خشوع ئەچێنێ لەناو کێڵگەی دڵ

زوو پاکی ئەکا پێش بگا بە گڵ.[1]

✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻ ✻

١ – (نوسەر)لەکتێبی (ڕاستی تەمەن)بەرگی دووهەم.

خوێنەری بەڕێز ئەمانەی باسمان کرد چەند چارەسەرێك بوون لەو چارەسەرانەی کە بەدیدی خەڵکی ڕوون و ئاشنان، وە تابۆت دەکرێت و لەتوانات داهەیە هەوڵ بدە لێی بەهرەمەند بی و دوای ئەوەش هەوڵبدە خەڵکی لێ ئاگەدار بکەیتەوە تاوەکو دوو پاداشتت بۆ بنوسرێت هەم بۆخۆت و هەم هی ئەویش کە پێت ڕاگەیاندووە،یاخود کەسانی تری لێ ئاگەدار بکەرەوە کە کتێبێکی وا هەیە بەڵکو ئەوانیش دەی خوێننەوەو بەیارمەتی خودای گەورە کێشەکانیان چارەسەر دەکەن،وە پێغەمبەرمان دەفەرمووێ:(الدّالُ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ)[1] .واتە:ئەو کەسەی کە چاکەیەك بەکەسێك پیشان بدات،وەکو ئەوە وایە کە خۆی ئەنجامی دابێت.واتە هەمان پاداشتی بۆ هەیە بەبێ ئەوەی لەپاداشتی ئەنجام دەرەکە کەم بکات.بەم کارەی تۆ ڕۆشنبیری و ڕوناك بینی بڵاو دەبێتەوە لە کۆمەڵگا پڕ لەکێشەو گیروگرفتەکەمان،بۆ ئەوەی بەیارمەتی یەکتری ئەم هەموو کێشە و ناڕەحەتیە بگۆڕین بۆ خۆشی وئاسودەیی، کە ئەمەش دیارە بەتەنیا بەکەسێك ناکرێت، وە لەکۆتاییی دا کۆمەڵە ئامۆژگاریەکی چەند دانایەکی ڕۆژگار باس دەکەین بۆ زیاتر ئاشنابوونمان بەهۆکارەکانی خەم و چارەسەرەکانیان لەهەمان کاتدا:

یەکێك لەدانایان دەفەرمووێ: وازهێنان لەقسەی زیاد و پڕوپوچ بەرهەمەکەی قسە کردنە بەحیکمەت و دانایی،وەواز هێنان و خۆپاراستن لەسەریرکردنی ئافرەتی نامەحرەم ترسی خواو ملکەچی لەدڵ دروست دەکات،هەرکەسێ واز بهێنێ لە زۆر خواردن ئەوا لەززەت و چێژی خواپەرستی وەردەگرێ،وەهەروەها وازهێنان لەزۆر پیکەنین سام و هەیبەتت زیاد

---

١ ـ صحيح الجامع الصغير(٣٣٩٩).

دەكات،بەخۆپاراستن لەماڵی حەرام بەهەشت بەدەست دەهێنی،وە وازهێنان لەجاسوسی و گەڕان بەدوای عەیب و عاری خەڵك بەرهەمەكەی چاك بوونی عەیب و عاری خۆتە، وازهێنان لەبەد گومانی لە زاتی خودای گەورە بەرهەمەكەی نەمانی گومان و دووڕوویە،

- لوقمانی حەكیم بەكوڕەكەی دەڵێ:هەركەسێك بەزەیی بەخەڵك دابێتەوە خەڵكیش بەزەییان بە ئەودا دێتەوە، هەركەسێ بێ دەنگ بێ سەلامەت دەبێ، هەركەسێ كردەوەی چاك بكا دەیباتەوە، هەركەسێ كردەوەی خراپ بكات تاوان باردەبێت،وە هەركەسێكیش جڵەوی زمانی خۆی لەژێر دەستی دانەبێ،و نەتوانێ بیگرێ ئەوا پەشیمان دەبێتەوە.

هەروەها لە پەڕاوەكانی صحفی ابراهیم (علیە سلام)داهاتووە پێویستە لەسەر پیاوی ژیر و عاقڵ زۆر بینەر بێ بەسەر دەم و زمانی خۆی ، ڕوو بكاتە كاروباری خۆی بەچالاكی ڕایبپەڕێنێت وە زمانی خۆی بپارێزێ تاوەكو شەیتان لێ نەبردووە،هەروەها گوتراوە: براكەم! وریابە خەڵكی ناشرین مەكە بەعەیب و عارێك كە لێیان دەبینی چونكە لەوە دەترسم تۆش توشی ئەوە بیت و ئەویش چاك بێتەوە [1] .

درود و سەلامی خودای پەروەردگار لەسەر گیانی پاكی پێغەمبەری پێشەوامان و یار و هاوەڵ و شوێن كەوتوانی،خودایە پەنات پێ دەگرین لەهەموو خەم و خەفەتێك كە ترسی ئیمان لەدەست دانی لێ دەكەوێتەوە و ڕەش بینی بەدواوەیە..

**اللهم آمين برحمتك يا أكرم الأكرمين.......**

---

١ ـ بحر الدموع (ابن الجوزي)لاپەڕە (١٧٣).

## بەسەرهاتەکان

وەرن بابەیەکەوە بەسواری وشەجوانەکان گەشتێك بەناو بەسەرهاتە ڕەنگینەکانی ڕابردوودا بکەین بۆ ڕازاندنەوەی ناخ مان و پاکردنەوەی لەتەم و مژی خەم و دڵتەنگی،مرۆڤ جاری واهەیە بەهۆی کێشەیەکەوە خۆری دڵ خۆشی لەڕوخساری ئاوا دەبێت و بێ تاقەتی ڕووی تێ دەکات، ئەچن دڵی بدەنەوەو زۆر لەگەڵی خەریك ئەبن بەڵام هەرناتوانن دڵی خۆش بکەن بەڵام کاتێك نمونەیەکی بۆدەهێننەوە لەو کێشەیەی کە ئەو توشی بووە،کە بەهەمان شێوە لەکەسێکی تریشدا ڕووی داوەو ئەو کەسە بەتوانای خۆی،خۆی لێ ڕزگار کردووەو ئەم هەڵ وێستەی وەکو ئەزموون و پەندێك بۆ دوای خۆی ماوەتەوە،لێرەدا ئەو کەسە بەشێوەیەکی زۆر جیاواز کاری لێدەکات،ئەمە بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە زیاتر بەنمونە هێنانەوە مرۆڤ پەند و دەرس وەردەگرێت و باشتر تێ دەگات و ئەتوانێت کێشەکانی بەسود وەرگرتن لەئەزموونی ئەوانەی پێشوتر چارەسەربکات،وە بۆدرێژە پێدان و کۆکردنەوەی هۆکارو چارەسەرەکانی تر کەلەپێشووتردا باسمان لێوەی کرد،ئەم بەسەرهاتانە باس دەکەین لەبەرئەوەی ئەم بەسەر هاتانە هەم هۆکار وەهەم چارەسەر وەهەم پەندی تایبەت بەبابەتەکەمانی تێدا بەدی ئەکرێت.

**یەکەم**: زۆر جاری وا هەیە ڕازی نەبوون بەوەی کە هەتە بەرەو لوتکەی بێ تاقەتیت دەبات و لەوێوە دەبێت سەیری باڵندەکان بکەی کە نیشتونەتەوە لەسەر زەوی کەچی تۆ لەوان بەرزتری ئەوانیش توانای فڕینیان هەیە و تۆنیتە.

بۆیە دەبێت بزانی خاوەنی چەندەی نەك بیرلەو شتانە بکەیتەوە کەنیتە،لەوێنەی پیاو چاکێك کەبەرێ ئەکەوێ بۆ ئەنجام دانی حەج،لەڕێگا بەهۆی زۆری ڕۆیشتن پێڵاوەکانی شڕئەبن،گەرمای بیابانیش پێی ئازار دەداتْ، بەردەوام دەبێ لەسەفەرەکەی لەگەڵ بێزاری ئەو چارە ڕەشیەی کە ئەوەندەش پارەی نیە سواری گوێدرێژێك بێت،کاتێ دەگاتە مەککە،زۆر بێ تاقەت و خەمبار دەبێت بەهۆی قاچەکانی کە ئازاریان هەیە،وەلەسەر ڕێگە کەیدا یەکێك دەبینێت لەپاڵ دەرگایەکدا،کە هەردوو قاچی بڕاوەتەوە،ئەمیش کە ئەم مەشهدە دەبینێت،دەست دەکان بەگریان و داوای لێخۆش بوون لەخودا دەکات و سوپاسی خودا دەکات لەسەر ئەو نیعمەتەی کە پێی بەخشیوە کەچی ئەو بەهۆی ئازارێکەوە لەبیری کردووە [1].

**دووهەم**: دانایەکی سەردەم دەڵێت هەرگیس بڕیار لەسەر شتێك مەدە کە لێی دڵنیانی و تەنیا بینیو تە یان بیستوتە بۆنمونە:

-کچێکی گەنج دەبینی لەتەنیشت شوفێرێکی تەکسیەوە دانیشتووە و کوشنەکانی تریش چۆڵن،ئەوە خێزانی شۆفێری تەکسیەکەیە خەیاڵت نەڕوات.

---

١ – لەکتێبی نمونە بەرزەکان لاپەڕە (٤٤) نوسینی (حسێن محمود هەڵەبجەیی)بەدەست کاریەوە.

- ئەگەر پیاوێکی خاوەن ڕیش دەبینی لەکاتی بانگدا،لەبەردەم مزگەوتێکەوە تێدەپەڕێت، بێئەوەی بچێتە مزگەوتەوە ،ڕەنگە لە مزگەوتێکی تر ڕاستەوخۆ دوای بانگ نوێژی کردبێت و بەپەلە هاتبێتە دەر.گومان مەبە کە ئەو نوێژ نەکەر بێت.

- لەناو پاسێك دا لەتەنیش کەسێکەوە دادەنیشیت،سڵاوی بۆدەکەی و وەڵامت ناداتەوە، یەکسەر لەمێشکتدا بڕیاری هەڵەی لەسەر مەدە،ڕەنگە گوێی لێ نەبووبێ.

- هاوڕێیەکت لەزانکۆ لەگەڵت دایە نایەتە کافتریاو قاوەیەکت لەگەڵ ناخواتەوە،ئەو کەسێکی ڕەزیل نیە،بەڵکو بیری لای باوکیەتی بەچ حاڵێك پارە پەیدا دەکات و مانگانە چەند هەزار دینارێکی بۆ دەنێرێت.

- زۆربەی کات،تۆ تەنیا بەشێکی کەمی وێنەکان دەبینی،بۆیە لەمێشکی خۆتدا بەشەکاتر بەوێنەیەکی باش لەمێشکت بکێشە و گومانی باش بە خەڵك ببە،

- پیاوێك گوتی: ئەگەر هاوڕێکەم ببینم دلۆپ دلۆپ شەڕابی پێدا بێتە خوارەوە،ئەوا دەڵێم: دڵنیام پێی دا ڕژاوەو من ڕەوشتی هاوڕێکەم شارەزام.

- ئەگەر هاوڕێکەم بینی لەسەر شاخە و دەڵێ: من خودای ئێوەم! ئەوا بێ دوو دڵی دەڵێم: ئەوە یەکێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە.ئەمەیە بڕیاردان دوای بیرکردنەوە ،چ چاکەیەکی لێ دەکەوێتەوە.

**سێهەم:** ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەت شێخ(حەسەنی بەصری)خوا لێی ڕازی بێت، گوتیك باران نابارێت چی بکەین ئەی پیاو چاك؟،ئەویش فەرمووی:تەوبە بکەن و زۆر ئستغفار بکەن،پیاوەکەش دەڵێ باش و دەڕوات،لەپاشاندا کەسێکی تر دێت دەڵێت ڕزقمان کەمە و دارایمان باش نیە ،پێی دەفەرمووێ: تەوبە بکەن و داوای لێ خۆش بوون لە پەروەردگارتان بکەن،ئەویش دەڵێ باش و دەڕوات، یەکێکی تر دێت دەڵێ: منالّمان نابێت، پێی دەفەرمووێ: داوای لێخۆش بوون لە خودا بکەو بگەڕێوە بۆ لای ، ئەویش دەلێ باش و دەڕوات،لەپاشان لێی دەپرسن باشە بۆچی هەرکەسێك هاتوو داوای چارەسەری کێشەکەی خۆی کرد تۆ هەر پێت گوتن بڕۆن تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە و داوای لێ خۆش بوون لە پەروەردگارتان بکەن ،ئەویش دەفەرمووێ: من هیچ چارەسەرێکم دانەناوە ئەوەتا پێش ئەوەی من قسەیەکی تیا بکەم خودای پەروەردگار پێش هەموو کەسێك چارەسەری بۆ داناوە کە دەفەرمووێ: (**فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾ نوح**).واتە: داوای لێخۆش بوون لە پەروەردگارتان بکەن ،چونکە هەمیشە گوناح پۆشە، هەر لەبەر ئەمە بارانتان پەیتاپەیتاو بەلێزمە بۆ بەردەداتەوە،وە دارایی و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێت،وە چەندین باخات و بێستانتان دەداتێ کەجوانترین هۆن بۆ ڕابواردن و خۆشی گەلان، وەئاو و ڕوباری زۆریشتان بۆ بەدی دەهێنێت کە لەژێر بنکی درەختە کانیاوە ئەو چۆمە دێ و

دەڕوات.ئەمانەش واتە ئەو هەموو بەخششە و خەڵاتەی خودای پەروەردگار بەهۆی تەوبەو گەڕانەوەیە بۆلای ئەو و سوپاس گوزاریە لەهەموو بارێکدا.[١]

-وەهەروەها شێخ (حەسەنی بەصری)خوا لێی ڕازی بێت،دەفەرمووێ: قسەی چوارکەس زۆر کاریان تێ کردم لەژیانم کە تامردن لەیادم ناچن:

١- پیاوێکم بینی دەسی لەگوناه هەڵنەدەگرت پێم گوت بەسە تاکەی ئەویش گوتی: نامەی کتێب بۆ ئاخیری دەگەڕێتەوە،خودا دەزانێت ئاخیری من و تۆ چۆن دەبێت و کێ ئاخیر خێر و کێ ئاخیر شەڕ دەبێت.

٢- ژنێکی جوان هاتە لام بۆسکاڵاکردن لەدەست زوڵمی پیاوەکەی،پێم گوت: سەرەتا خۆت داپۆشە پاشان قسەی خۆت بکە،ژنەکە گوتی: من بەجۆرێك لە گێژاوی دنیا دا ڕۆچوم کە ئاگام لەحاڵی خۆم نیە،تۆ چۆن غەرقی خۆشەویستی خوایت و دەتوانی من ببینی؟!!

٣- سەرخۆشێکم بینی بەملاو لادا دەکەوت و خۆی ڕاست پێ نەدەگیرا،پێم گوت: ئاگات لەهەنگاوەکانت بێ خۆت قایم ڕاگرە بانەکەوی، ئەویش گوتی: ئەگەر من بکەوم تەنیا خۆمم،بەڵام تۆ ئاگات لە هەنگاوەکانت بێت چونکە ئەگەر تۆ بکەوی ئوممەتێك لەگەڵ تۆدا دەکەوێت.

---

١ ـ موسوعة الأسلامية لاپەڕە(٩٧-٩٨)**نوسینی** (سعيد يوسف محمود عزيز)،بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە تەفسیری مونیر مجلدی(١٥)**لاپەڕە** (١٥٧) لەنوسینی (د.وهبت زوحەیلي).

٤- منداڵێکم بینی چرایەکی بەدەستەوە بوو،پێم گوت:ئەم چرایەت ڕووناکی لەکوێ بوو، ئەویش فووویەکی لێ کردوو کوژاندیەوە،گوتی: تۆ کە شێخی شاری پێم بڵێ ئەم ڕوناکیە بۆ کوێ ڕۆیشت؟!!.

**چوارەم:** (لوقمانی حەکیم) بەکوڕەکەی گوت: ڕۆڵەکەم ئەو نوێژەی کەلەسەرت واجب کراوە بەپوختی جێبەجێی بکە لە هەموو ئەو کردەوە چاکانەی کە دەیکەیت باشترە، چونکە نمونەی نوێژ و تەسبیحات کردنی خوا وەك کەشتیەك وایە لەنێوان دەریادا،ئەگەر کەشتیەکە سەلامەت بوو ئەوا خەڵکی نێو کەشتیەکەش سەلامەت دەبن بەڵام ئەگەر کەشتی یەکە نقوم بوو، بێگومان خەڵکی نێو کەشتیەکەش هەموویان نوقوم دەبن.

هەروەها دەفەرمووێ: ڕۆلەکەم.....

ئەگەر چویتە نێو قەومێك لەکۆڕو مەجلیسیان دانیشتی ئەواتیری ئاشتی ئیسلامیان تێبگرە ،واتە سەرەتا سەلامیان لێ بکە،ئینجا لەشوێنێك یان لەسوچێك بۆ خۆت دانیشە،وەهیچ قسەیەك مەکە تاوەکو ئەوان دەبینی دەست دەکەن بەقسەکردن،ئەگەر دانیشتی و کۆڕیان زیکری خوابوو،خۆت بێ بەش مەکە لەو دانیشتنە و لەگەڵیان بەشداربە لەو بەشەدا،بەڵام زیکری خوایان نەدەکرد و سەرقاڵ بوون بەشتێکی تر،لەوێ بڕۆ بۆ لای کەسانێکی تر.

هەروەها دەفەرمووێ: ڕۆلەکەم.....

ئەگەر توشی تاوان و گوناهێك بوویت ئەوا خێر و سەدەقەیەك بکە چونکە ئومێد وایە ئەو خێر و سەدەقەیە ببێتە سڕینەوەی تاوانەکان.

وەدەفەرمووێ: ئەگەر ویستت هاوڕێیەتی و دۆستایەتی کەسانێك بکەی سەرەتا توڕەی بکە،ئەگەر لەکاتی توڕەبووندا لێبووردنی خۆی پێت نیشاندا نەك دوای سارد بوونەوەی ئەوە هاوڕێیەتی ئەو کەسە بکە بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوون،لێبووردنی نەبوو خۆتی لێ بپارێزە.

وەدەفەرمووێ: ئەگەر خەڵکی خۆیان لەسەر یەکتر گەورە دەکرد بەقسەی جوان و فەسیح ئەوا تۆ خۆت لەسەریان گەورە بکە بەبێ دەنگ بوونی جوان.

لەکۆتایی دا دەفەرمووێ: ئەگەر خوا ویستی ناخۆشی ببەخشێ بەقەوم و گەلێك ئەوا دەرگای ململانێ و ناکۆکی و دەمەقالێیان لەسەر دەکاتەوە،هەروەها کەمی ئەنجام دانی کردەوەی چاك لەلایان شیرین دەبێ،واتە: کردەوەی باشیان کەم دەبێ.[1]

١ ـ لقمان الحكيم، لەنوسینی (محمد عبدالرحیم)،لاپەڕە(٢٣).

**پێنجەم:** باوکەکە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە،بەڵام کوڕە بچوکەکەی هاروهاجی دەکرد و پەرێشانی کردبوو،خەریك بوو ئیتر چێژی خوێندنەوەکەی لیَ تێك بدات،لەسەر ڕۆژنامەکە نەخشەیەکی جیهانی هەبوو،باوکە کە ڕۆیشت وڵات بەوڵات جیایکردەوە و بەکوڕەکەی گوت: وەرە ئیشم پێتە ،ئەمە نەخشەی جیهانە دەیدەم بە تۆ،بزانم دەتوانی وەکو خۆی چاکی بکەیتەوە و بینوسێنتەوە بەیەکەوە؟

ئیتر ڕۆیشتەوە بۆ ڕۆژنامە خوێندنەوە ،ئەیزانی کوڕەکە تا ئێوارە گرفتاری ئەو کارە دەبێت و پێی تەواو ناکرێت و ئەمیش بەئیسراحەت ڕۆژنامەکە دەخوێنێتەوە،بەڵام یەك چارەگی پیَ نەچوو کوڕەکە هاتەوە نەخشەکەی وەك خۆی لێکردبووەوەو دایە دەستی باوکی،باوکی سەری سوڕما، پێی وت دایکت وانەی جوگرافیای پیَ وتوی؟

کوڕ وەڵامی دایەوە: جوگرافیا چیە؟ باوکی گوتی:ئەی باشە چۆن توانیت ئەم نەخشەیە وەك خۆی لێبکەیتەوە؟

کوڕەکە گوتی: ئاخر لەپشت ئەم لاپەڕانەوە یانی پشتی نەخشەکە لەو دیوەدا وێنەی مرۆڤێك بوو،کاتێك توانیم دووبارە مرۆڤەکە چاك بکەمەوە توانیشم جیهان دووبارە چاك بکەمەوە.بێگومان مرۆڤەکان چاك بن دونیاش بەجاریَ چاك دەبێتەوە.

**شەشەم:** پێش ئەنجام دانی هەر کارێك چەند ڕێگەچارەی جۆراوجۆر هەڵسەنگێنە:

ئەگێڕنەوە لەوڵاتی ژاپۆن پیاوێکی ملیۆنەر ئەژیا ئەم پیاوە بەدەست چاو ئێشەوە ئەیناڵاند،ئازارەکە خواردن و خەوی لیَ حەرام کردبوو،بۆ چارەسەری ئازارەکەی هەموو

جۆرە دەرزی و دەرمانێکی تاقی کردبووەوە بەڵام هیچ کەڵکی لێوەرنەگرتبوو،ئەو پاش ڕاوێژی فراوان لەگەڵ پزیشکەکان و شارەزایان ئەگاتە ئەو قەناعەتەی کە دەمانی دەردی لای ڕاهیبێکی[1] شارەزاو و ناسراوە،ئەو سەردانی ڕاهیبەکە دەکات بۆئەوەی چارەسەری بکات،پاش پشکنین و گوێگرتن لە پیاوەکە،ڕاهیبەکە پێی ڕادەگەیەنێت کەبۆ چارەسەری ئازارەکەی بۆماوەیەك سەیری هیچ ڕەنگێك نەکات تەنیا ڕەنگی سەوز نەبێت،دوای گەڕانەوەی لەلای ڕاهیبەکە فەرمان دەکات بەخزمەتکارەکانی کە چەند بەرمیلێك ڕەنگی سەوز و کەلوپەلەکانی ناوماڵیش بگۆڕن بەهەمان ڕەنگ،پاش ماوەیەك ئۆتۆم بێلەکەی و جلی خزمەتکارەکانی و هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەریەتی ئەگۆڕێت بۆ سەوز،جێ باسە بەم کارەی ئازارەکەی چاوی نامێنێت،پاش ماوەیەك پیاوە ملیۆنێرەکە ڕاهیبەکە دەعوەت دەکات بۆئەوەی سوپاسی بکات، ڕاهیبەکە بە جلی پرتەقاڵیەوە یەتە ناوماڵەکەوە کە دۆخەکە دەبینێت تێ دەگات و جلەکانی دەگۆڕێت، پاشان دەچێتە لای نەخۆشەکەی و دادەنیشێت لێی دەپرسێت ئایا چاو ئێشەکەت باش بووە؟ پیاوە دەوڵەمەندەکەش سوپاسی دەکات و دەڵێ: بەڵێ بەڵام بەڕاستی ئەمە گراترین چارەسەر بووە کە من وەرم گرتووە، ڕاهیبەکەش دەڵێ: بەپێچەوانەوە ئەمە هەرزانترین چارەسەر بووە کە من بۆ نەخۆشێکم داناوە! بۆچارەسەری چاوئێشەکەتان تەنیا پێویست بوو چاویلکەیەك بکڕیت کە شوشوکەی سەوز بێت وە هیچ پێویستی بەم هەموو پارە بە فیڕۆدانە نەدەکرد،بۆئەوەی چاوەکانت چارەسەر بێت ناتوانیت ڕەنگی هەموو دونیا

---

[1] – ڕاهیب بە پیاوێکی ئاینی لەخواترسی مەسیحی ئەوترێت.

بگۆڕیت بەڵام بەگۆڕینی بینینی خۆت دەتوانیت دونیا بەو شێوەیە ببینیت کە خۆت دەتەوێت.

ئەنجام : گۆڕینی جیهان کارێکی نەزانانەیە بەڵام گۆڕینی بەرچاو و بینینی خۆمان هەرزانترین و کارسازترین شێوازە.

**هەشتەم:** بازرگانێك بەسواری ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی کە لەجۆری (جاکوار)بوو،بەنێو یەکێك لە شەقامەکاندا بەدڵێکی خۆشەوە بەرەو نوسینگەی کارەکەی دەڕۆیشت،لەناکاو ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی،کەچەند ڕۆژێك بوو کڕیبووی، بە بەردێکی گەورە لەلای ڕاستی شەقامەکەوە پێکرا! بازرگانەکە بەخێرایی لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی تا بزانێت کێ بوو ئەو بەردەی گرتە ئۆتۆمبێلەکەی وسەیری ئەو زیانەش بکات کەبەر ئۆتۆمبێلەکەی کەوتووە، لەوکاتە دا منداڵێکی بینی لەسوچێکی شەقامەکەدا وەستابوو،کە بەڕووخسارییەوە نیشانەی ترس و دڵە ڕاوکێ دیار بوو، بازرگانەکە لە کاتێك دا پەستی و توڕەیی نێوچەوانی تاریك کردبوو،لەمنداڵەکە نزیك بوویەوە،یەخەی منداڵە بێچارەکەی گرت و بەدیوارەکەوە نوساندی و زۆر بەتوڕەیی پێی گوت:نەزان دەزانیت بەم کارەت دەبێت هەموو سەروەتی خۆشت و باوکیشت بدەیت بۆ پڕکردنەوەی ئەو زیانەی لە ئۆتۆمبێلەکەم کەوتووە،لەو کاتەدا هۆن هۆن فرمێسك لەچاوی منداڵەکە دەهاتە خوارەوە، بەقوڕگێکی پڕ لەگریان و بە چاوی ئەسرین و بەدەنگێکی کزۆڵ و خەمبارەوە بەبازرگانەکەی گوت: زۆربەداخەوەم بۆ ئەم ڕووداوە ببورە..!!، لەڕاستیدا من نەم دەزانی چ کارێك بکەم، لەبەیانی زووەوە لەو شوێنە وەستاوەم، چاوەڕێم کەسێك ئاورم لێ بداتەوە و لایەکم لێ

بکاتەوە،بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە،تەنها کەسێك بە دەممەوە نەهات،پاشان لەگەڵ هەڵوەرینی فرمێسکەکانی ئاماژەی بۆ ئەوبەری شەقامەکە کرد، کوڕێك لەسەر زەویەکە کەوتبوو،پاشان بەدەم گریان و هەنیسکەوە بەرەولای کوڕەکە ڕۆیشت و گوتی:ئەو کوڕەی لەنێو ئەم چاڵەدا کەوتووە برامە!، ئەو ناتوانێت بە ڕێگەدا بڕوات،قاچەکانی بەتەواوی لەکار کەوتوون، پاشان منداڵەکە گوتی: کورسییەکە تێکچووە، کورسییەکە لەدەستم ترازاو کەوتە ئەم چاڵەوە، منیش زۆر هەوڵم دا بەرزی بکەمەوە و بیخەمە سەر کورسییەکە بەڵام نەمتوانی، دەستم لەزۆر ئۆتۆمبێل ڕاگرت، تایارمەتیم بدەن، کەس نەوەستا براکەشم لەو چاڵەدایە،ئیدی دەبوا چیم بکردایە تا کەسێك ئاوڕم لێ بداتەوە و هاوکاریم بکات..!، تەنها ڕێگەیەك کە بەبیرم داهات بۆ ڕزگارکردنی براکەم ئەوە بوو کە بەردێك بگرمە ئۆتۆمبێلێك تا خاوەن ئۆتۆمبێلەکە لەبەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆی ڕابووەستێ و حاڵ و گوزەرانی ئێمەش ببینێ و یارمەتیم بدات بۆ دەرهێنانی براکەم !! ،خاڵەگیان ئێستا ئامادەیت یارمەتیم بدەیت تا براکەم لەو چاڵە دەربهێنمەوەو بیخەینە سەر کورسیەکەی خۆی ؟!،بازرگانەکە بەبینینی ئەم ڕووداوە یەکجار خەمباربوو،ماوەیەك بەسەرسامی ڕاوەستا و پاشان باوەشی بەمنداڵەکە کرد و داوای لێبووردنی لێکرد،ئینجا باوەشی بە منداڵە ئیفلیجەکەدا کرد و لە چاڵەکەدا دەریهێناو خستیە سەر کورسییەکە،دەسڕێکی لەگیرفانی دەرهێناو برینەکانی بۆ پاککردەوە،کە بەهۆی کەوتنە نێوچاڵەکەوە دووچاری هاتبوو،پاشان منداڵەکە زۆر سوپاسی بازرگانەکەی کرد و لێی پرسی:ئێستا دەبێت من چی بکەم بۆ چاککردنەوە ئۆتۆمبێلەکەت؟ بازرگانەکەش وەکو کەسێکی میهرەبان دەستی بە سەریدا هێناو

وەڵامی دایەوە، کوڕی شیرینم خەمبار مەبەو شتێکی ئەو تۆ نیە،ئێوە خۆش بن، ئۆتۆمبێل شایەنی باسکردن نیە...

ئەوەش کە جێگەی سەر سوڕمان بوو ئەوەبوو کە بازرگانەکە بڕیاریدا ئۆتۆمبێلەکەی چاك نەکاتەوە،بۆئەوەی هەرکات سەیریکرد ئەو یادەوەریەی بیربێتەوە،هەروەها بۆ ئەوەش کە هیچ کەسێکی دی ناچار نەبێت بەردی تێبگرێت تا ئاوڕی لێ بداتەوە..

لەڕاستیدا ئێمە لە ڕۆژگارێك دەژین،سەرقاڵی و خەم تیایدا یەکجار زۆر بووە، هەر هەوڵی کۆکردنەوەی سەروەت و سامانین، واگومان دەبەین تا سەروەت و سامانمان زۆر بێت بەختەوەریمان زیاد دەبێت....!

نازانین کە بەختەوەری ئێمە لە زۆری سەروەت و ساماندا نیە، چەندین کەس هەیە لەم ژینەدا خاوەنی سەروەت و سامانی بێ شومارن، بەڵام خاوەنی بەختەوەری نین...

ڕەنگە زۆر کەس هەبن پێویستیان بە ئاوڕدانەوەیەك هەبێت، بەڵام کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە،تکایە باچیدی پێویست بەبەرد نەبێت بۆ ئاوڕدانەوە لە هەژاران و بێنەوایان.

**نۆیەم**: کرێکارێك هەبوو لەگەڵ دایکی و هاوسەر و منداڵەکانی دا دەژیا،ئەو کرێکارە لەگەڵ چەندین کرێکاری دیکە لای پیرەژنێك کاری دەکرد، کرێکارێك بوو تا بڵێی لەکارەکانی دا دڵسۆز بوو،کارەکانی خۆی بەباشترین شێوە ئەنجم دەدا،ڕۆژێك ئەو کرێکارە نەچووە سەر ئیشەکەی ،پیرەژنەکە وایزانی کە بەهۆی کەمی موچەکەیەوە نەهاتووە بۆ ئیش،بۆیە لەناخەوە گوتی:دینارێکی لە موچەکەی بۆ زیاد دەکەم،

کرێکارێکی زۆر دڵسۆزە،زیادکردنی موچەکەی وادەکات کە چیتر دوانەکەوێت،ئاخر ئامادەبوونی ئەو لێرە زۆر گرینگە،دوای ئەوەی ڕۆژی دواتر کرێکارە هاتەوە،ئەو ڕۆژە وەك هەمیشە کارەکانی خۆی ئەنجام دا بەباشی ،لەکۆتایی پیرەژنەکە دینارێکی زیادی خستە سەرموچەی ڕۆژانەی،بەڵام کرێکارەکە هیچ قسەیەکی نەکرد و پرسیاریشی نەکرد کە ئاخۆ هۆکاری زیادکردنی موچەکە چییە،دوای ماوەیەك جارێکی دیکە کرێکارەکە نەچووە سەر ئیشەکەی! پیرەژنەکە تووڕەبوو و لەناخەوە گوتی:بەهۆی نەهاتنی، لە ئەمرۆوە دینارێك لەموچەی ڕۆژانەی کەم دەکەمەوە، کە کرێکارەکە بۆ ڕۆژی دواتر گەڕایەوە سەر ئیشەکەی،دیسان لەکۆتایی ئەو ڕۆژە کە کارەکان تەواوبوون،پیرەژنەکە مووچەی ڕۆژانەی کەم کردەوە،دیسان کرێکارە هیچ قسەیەکی نەکرد و پرسیاریشی نەکرد کە بۆچی ڕۆژانەکەی کەم کراوەتەوە،پیرەژنەکە سەری لەم کارەی سوڕما،بۆیە دواتر بانگی کرد و پێی گوت: موچەی ڕۆژانەم بۆ زیاد کردیت،بێدەنگ بوویت،لێم کەم کردیەوە، هەر بێدەنگیت،باشە بۆچی؟!!، کرێکارە پێی گوت:کە جاری یەکەم نەهاتمە سەر ئیش،خودا منداڵێکی پێ بەخشیم، کەدینارەکەت بۆ زیاد کردم،گوتم :ئەوە ڕۆزی و ڕزقی ئەو منداڵەیە و لەگەڵیدا هاتووە،کە جاری دووهەمیش نەهاتمە سەر ئیش، بەهۆی ئەوە بوو کە دایکم کۆچی دوایی کرد،کەموچەکەت کەم کردمەوە،گوتم: کەم بوونەوەی ئەو دینارەی موچەکەم،ڕۆزی و ڕزقی دایکم بووەو لەگەڵ خۆیدا ڕۆیشتووە.....

بەڵێ ئازیزان ئائەمەیە قەناعەت کە وا لەتاکەکان دەکات هەبوونی و نەبوونی، کار لە بەختەوەریان نەکات.

**دەیەم:** لەیەکێك لەنەخۆشخانەکانی وڵاتی (سویسرا)پزیشکێکی گەنج لەگەڵ پزیشکێکی نەشتەرگەری کار دەکات وەك یارمەتی دەر و فێربوونی ئەزموونی ئەو پزیشکە بەرێزە، ڕۆژێك لەدوای تەواو بوونی نەشتەرگەری بۆ یەکێك لە نەخۆشەکان پزیشکە گەنجەکە ڕوو لە دکتۆرە گەورە و مامۆستاکەی دەکات و دەڵێت: من زۆر سودم بینی لە ئەزموو و کاری جەنابت بەڵام شتێك هەیە تا ئێستا تێنەگەیشتوم ئەویش ئەوەیە، بۆچی کاتێ نەخۆشێك دێت بۆ ژووری نەشتەرگەری پرسیاری ئەوەی لێ دەکەیت لە ژەمی دوێنێ ئێوارە لەماڵەوە چیتان خواردووە؟

دکتۆریش بەزەردەخەنەوە وەڵامی دایەوەو گوتی: بۆیە دەپرسم تا بزانم لەماڵەوە لە چ ئاستێکی ژیان دان و چۆن ژیان بەسەر دەبەن لەو پرسیارەوە بۆم دەردەکەوێت هەژار و نەدارن یان دەوڵەمەند و خوا پێداون ئەگەر فەقیر و هەژارو نەدار بوون ئەوە دەتوانم پارەی نەشتەرگەریان کەمتر لەخەڵکانی ترەوە بۆ هەژمار بکەم ....

نمونەی دکتۆری بەویژدان و مەرد لەم شێوەیە تاوەکو بە پێی توانا هاوکاری نەدارانی وڵاتەکەی بێت.

**یانزەهەم:** ئەزانی صەبری ئەیوب چیە!!!!؟

ئەیوب (٧) کوڕی هەبوو، (٧)کچیشی هەبوو،سامان و مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبوو،زۆر دەوڵەمەند بوو،وە حەفتاساڵیش لەسەر ئەم ژیانە خۆشەی بەردەوام بوو!، دوای ئەوە کتوپڕ خودای گەورە هەموو منداڵەکانی لێ سەندەوە،دوای ئەوە گشت

سەروەت و سامانەکەی لیّ سەندەوە ،دوای ئەوەش توشی نەخۆشیەك بوو کە چارەسەری نەبوو ئەبەد!،ئەو نەخۆشیە توشی هات بە جۆریّك قورس و بە ئازار بوو کە گۆشتی جەستەی لیّ ئەبوەوەو هەڵئەوەری ،دواتر بۆگەنی کرد بەجۆریّك خەڵکی بیّ چارەبوون دووریان خستەوە لە خۆیان هەرچەندە پیّغەمبەری خواش بوو،خیّزانەکەی پیّغەمبەر ئەیوب(علیه سلام)،ئەچوو ئیشی بۆ خەڵکی ئەکرد هەتا خزمەتی ئەیوبی پیّ بکات، تاوای لیّ هات ئیشیان پیّ نەدەکرد و ئەویشیان دوور خستەوە لەخۆیان چونکە ئەیات وت تۆ ئیّمە توشی نەخۆشی دەکەیت،چونکە سەردانی ئەیوبی دەکرد،ئەیوب وای لیّ هات کرم لەسەر گیانی دەکەویّتە خوارەوە ئەویش هەڵی دەگریّتەوە و کرمەکەی ئەخستەوە لەشی خۆی ،ئینجا تاقی کردنەوەکە گرانتر بوو بۆ ئەوەی کە تەنها دڵی لیّی ئەداو تەنها زمانی ئەجوڵا..!،(١٨)ساڵ بەو نارِەحەتیە مایەوە ،بۆ یەکجاریش لەرِووی نەهات بڵیّ خودایە شیفام بدە،هەتا خیّزانەکەی پیّی گوت: تۆ یەك جار داوا لە خوا بکە من دڵنیام خودای پەروەردگار شیفات دەدا،ئەیوبیش پیّی فەرموو: عەیب و شەرمەزاریە (٧٠)ساڵ لەناو نیعمەت و بەروبووم ژیاندوومی ئیّستاش (٧٠)ساڵ لە نارِەحەتی و ئازاری صەبر نەگرم؟!،هەتا لەکۆتایش لەرِووی نەدەهات و تەنها فەرمووی: خودایە من توشی نارِەحەتی هاتووم و تۆش بەخشندەی بەخشندانی،خودای گەورە شیفای بۆ ناردو پیّی فەرموو: هەستە لەو ئاوە بخۆرەوەو خۆت بشۆرەوە،پاشان بوەوە بە خاوەنی (١٤)کچ و (١٤) کورِ و سەروەت و سامانیّکی زۆر زیاتر لەوەی پیّی درابوو لە رِابردوو،گەرِایەوە بۆ سەردەمی پیّش(١٨) ساڵەکە بە دووقاتەوە لەپاداشتی ئەو صەبرِە عەزیمە....! .

ئەی باشە صەبری ئێمە تا چ ئاستێکە با وەڵامەکەی بۆ ئێوە جێ بهێڵم.....!!!.

**دوانزەهەم**: پیاوێك باسی خێزانەکەی دەکات و دەڵێت: پێش چەند شەوێك بەر لەنوستنم لەسەر جیگەکەم ،سەیری خێزانەکەمم کرد کە وا دیار بوو نوستبێ،منیش لەنێو دڵی خۆمدا گوتم: چەند بە متمانەیە دوای ئەوەی چەندین ساڵ لەنێو دایك و باوك و لەنێو خزمانی ژیا،هاتووە لەپاڵ پیاوێکی نەناسراو دەخەوێت!

وەماڵەوە جێ هێشتووە، وە خۆشی نێو خزمانی جێ هێشتووە،وە هاتووە بۆلای پیاوێ کە فەرمانی چاکە و دوور کەوتنەوە لەخراپەی پێ دەکات وە لەخزمەتی دایە بۆ ئەوەی خودا لەخۆی ڕازی بکات،لەم کاتە دا کۆمەڵێك پرسیار لەنێو دڵم دروست بوو؟!

ئەی چۆن هەندێك پیاو وادەکەن؟ کەلە ئافرەتەکانیان ددەن بەهەموو شێوەیەك لەکاتێك دا ئەو ماڵی باوك و دایکی لەبەر خاتری ئەو جێ هێشتووە؟

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ کە لەگەڵ هاوڕێکەی دەچێتە چێشتخانە خواردن دەخوات وە گوێ نادات بەو کەسەی کە لە ماڵەکەیەتی!

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ کەماوەی دانیشتنی لەدەرەوە زیاترە لەو ماوەیەی لەگەڵ ماڵ و منالی دادەنیشێ!

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ کەماڵی بۆ خێزانەکەی کردۆتە بەندیخانە کە نە دەهێڵێ بچێتە دەرەوە وە نەلەگەڵی دەمێنێتەوە !!!

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ کە خێزانەکەی بنوێت بەئاهێکەوە لە نێو دڵی کە نەتوانێ دەری ببڕێ تەنها بەفرمێسکی شاراوە نەبێ لەترسی مێردەکەی تا پێی نەزانێ!!

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ کەسەفەر دەکاو گوێ نادات بەخێزان و منداڵەکەی لەو کاتەی کەبەجێی هێشتوون،ئەمە چ ویژدانێکە ئەوەنە غەرقی تاوان بوو کەهیچ نەبینێت!

ئەی چۆن هەنێ پیاو وادەکەن ؟ واز لەو بەرپرسیارییەتییە دێنێت کە ڕۆژێك دێت لێپرسینەوەی لەسەری لەگەڵ دەکرێت .بۆیە تۆش متمانە بەهاوسەرەکەت بکەو لەناخەوە خۆشتبوێ و دڵ و هەستت لەگەڵیدا بەش بکە.

**سیانزەهەم**: دایکێکی تێگەیشتوو ئامۆژگاری کچەکەی دەکات و وانەیەکی زۆر گرینگی فێر دەکات:

لەبەردەم ماڵێك دا کانیەکی سازگار هەبوو،بەڵام تابلێی ئاوی کەم بوو،دلۆپ دلۆپ ئاوی پیادا دەهاتە خواری ،ژنی ماڵەکە هەمیشە گۆزەیەکی لەبەردەم دلۆپەکان دانابوو،کە بەماوەیەکی زۆر گۆزەکە پڕدەبوو، هەمووجا بەکچەکەی دەگوت: کچم ئاگات لە گۆزەکە بێت، ڕۆژێکیان کچەکەی بەگریان هاتەوە و بەدایکی گوت: دایکە! گۆزەکە کەوت و ڕژا، زۆر سەیر ڕژا !! نازانم چۆن ئەوەی بە چەند سەعاتێك پڕبوو بەك دەقیقی ڕژا ،دایکەکەش فرمێسکی کچەکەی سڕی و پێی گوت: کچی خۆم خەم مەخۆ تازە ئاوەکەمان لەکیس چوو بەڵام لەمە وانەیەك وەرگرە،بڕوانە ئەوەی دلۆپ دلۆپ پڕ دەبێت،قوڵپ قوڵپ دەرژێت، بزانە ئابڕوو و کەسایەتی(شەخصیەت)و بەهاو ئاکاری جوان زۆری پێدەچێت تا

مرۆڤ كۆيان دەكاتەوە و پێیانەوە دەناسرێت،بەڵام بەهەڵەیەكی بچوك، بەهەڵ وێستێكی نەشیاو لەكاتێكی كەمدا لەدەستیان دەدات.

مرۆڤ ئەگەر بیر بكاتەوە لەو شتە سادانەی كە ڕۆژانە لەدەورو بەری ڕوودەدەن ئەوكاتە فێری زۆر شت دەبێت كە دەبنە ئەزموون بۆ ژیانی.

**چواردەهەم**: یەكێك لەباشترینی ئەو كەسانەی كە چاكەیان لەگەڵ دابكەیت منالّی هەتیوە،لەبەرئەوەی هەرگیس چاكەكەت لەلایەن پەروەردگارەوە لەكیس ناچێ، بۆنمونە یەكێك لەپیاو چاكەكانی پێشوو (السلف الصالح)دەفەرمووێ: سەرەتا پیاوێكی سەرخۆش بووم و گوناه و تاوان لەگەڵ هەناسەو ژیانم تێكەڵ بوو،ڕۆژێكیان كوڕێكی هەتیوو بێ باوكم بینی بەزەییم پێیدا هاتەوە و زۆر ڕێزم لێی گرت و چاكەم لەگەڵ كردزیاتر لەوەی باوك بۆ كوڕەكەی دەكات،پاشان شەوێك لەخەوم دا بینیم فریشتەكانی دۆزەخ (الزبانیة) ویستیان فڕێمدەنە ناو دۆزەخ لەناكاو دەبینم كوڕە هەتیوەكە بەرگری لێم كردو گوتی: وازی لێ بێنن تاوەكو قسە لەگەڵ خودا دەكەم و كارەكەی بۆ ئاسان دەكەم، ئەوانیش هەرسوربوون لەسەر قسەكەیان دەیانویست بمبەن،لەناكاو بانگێك هات،وتی: وازی لێ بێنن ئێمە لێی خۆش بووین بەهۆی ئەوەی چاكەی لەگەڵ ئەو كوڕە هەتیوەدا كرد،لەو خەوە هەستام و لەوە بەدواوە زۆر زیاتر لەوە ڕێزم لە هەتیوان دەگرت و چاكەم لەگەڵی كرد لەوەتەی ئەو ڕۆژەوە.[1]

---

١ – لەكتێبی (الجواهر عن اقتراف الكبائر)،نوسینی(ابن حجر الهيتمي) بەرگی یەكەم لاپەڕە (٥٤٧).

**پانزەهەم:** خاوەنی کتێبی (الفرج بعد الشدە)دەڵێ: یەکێك لەدانایان- الحکماء- توشی بەڵاو نەهامەتیەك هاتبوو،دۆستان و هاورێیان چونە سەردانی بەمەبەستی دڵدانەوەی وە سەرە خۆشی لێ کردنی،بەڵام حەکیم پێی گوتن:من دەرمانی ئەو دەردەم دۆزیوەتەوە لەتێکەڵاوی شەش شتی زۆر گرینگ ،گوتیان:ئەی دانا ئەو شەش شتە چیە؟

گوتی: تێکەڵاوی یەکەم : متمانە بوون بەزاتی خودای پەروەردگار،

دووهەم شارەزا بوونم بەوەی کەهەرشتێ خوا نەخشەی بۆ دانابێ دەبێ ئەو شتە ڕوویدات،

سێهەم: صەبرو ئارامگرتن باشترین شتە کەتاقی کراوەکان بەکاری بێنن،

چوارەم: ئەگەر خۆڕاگ نەبم چی بکەم؟ وەبەشین و واوەیلا هاوکاری نەفسم ناکەم،

پێنجەم:دەگونجێ کەمن لەخراپترین بەڵادا بم لەوەی کە ئێستا تێیدام ،

شەشەم: کاتژمێر بۆ کاتژمێر لەدوای ناخۆشی و نەهامەتی دا خۆشی و شادی دێت،کەواتە پێویست بەو خۆئازاردانە ناکات و باشتروایە مرۆڤ خۆڕاگربێت و ئیرادەی پۆڵاینی هەبێت.

**شانزەهەم:** زانا (تنوخی) دەڵێ: لەشاری بەغدا وەزیرێکی ستەم کار هەبوو ،جارێکیان ستەم لە پیرەژنێك دەکات و دەست بەسەر ماڵەکەی دادەگرێت و مافەکانی هەمووی لێ زەوت دەکات، پیرەژنەکەش بەچاوی پڕ لەگریانەوە دەچێتە لای شەکوای حاڵی خۆی لەلادەکات و باسی زوڵم و ستەمی ئەوی لەلا دەکات کە لێی کردووە،بەڵام هیچ کاری

تێناكات و تەوبە ناكات،بۆیە پیرەژنەكە لەكۆتاییدا دەزانێت سودی نیە قسەكانی لەلای ئەو پێش ئەوەی بڕوا دەڵێ: بانگی خوا دەكەم و دوعات لێ دەكەم، كاربەدەستەكەش بەقسەكانی پێ دەكەنێ و بەگاڵتەوە پێی دەڵێ: ئەگەر دوعاش دەكەیت لەكۆتایی نیوەی شەو بیكە چونكە دوعا لەو كاتەدا قبوڵە، كاربەدەستەكە ئەمە بەگاڵتە وەردەگرێت، لەبەر زوڵم و ستەمی كە دڵی تاریك كردووە، بەڵام پیرەژنی داماو و ستەم لێكراو بەردەوام دەبێ لەسەر دوعاكردن لێی لە كۆتایی نیوەی شەودا و لەدەرگای ئاسمان دەدات، لەناكاو خودا وەڵامی نزاو پاڕانەوەكەی دەداتەوە،كەمێكی پێ دەچێ ئەو وەزیرە لەگەورێتی و دەسەڵات دا دادەبەزێنرێ و ماڵی هەموو لێ وەردەگیرێتەوە و زەویەكانی لێ دەسێنرێتەوە، پاشان بەوەش وازی لێ ناهێنن دەیبەن لەبازاڕ داركاری دەكەن، چونكە خەڵكی چەوساندۆتەوە و ستەمی لێ كردوون، قەدەری خوا وادەبێ پیرەژنەكە بەوێ دا تێدەپەڕێ و دەیبینێ و پێی دەڵێ: احسنت...ئافەرین ڕاستت كرد، پێت گوتم كۆتایی نیوە شەو هەڵبژێرم بۆ دوعاكردن و دوعای تێدا قبوڵە،بۆیە تاقیم كردەوە،وابوو دوعا چاك قبوڵ بوو.[1] ئەنجام: هەرچەندە بەتوانابوویت نابێت تۆزقاڵێك مەیلت بۆ زوڵمكردن هەبێت، وا گومان ببەی دەتوانی زوڵم لەكەسێك بكەی و كەس لێت وەرناگرێتەوە،وە ئەگەر زوڵمیشت لێكرا و هەچەندە بێ دەسەڵات بووی ئەوەت لەبیر نەچێت كە خودایەك هەیە لە هەموو شتێك بەتواناترە،سكاڵاكانی خۆتی بۆ باس بكە دڵنیابە بێ وەڵام نابن و زوو یا درەنگ بەهاناتەوە دێت.

---

١ – لەكتێبی (صحیح وصایا الرسول)،المجموعة الثانیة،بەرگی دووهەم لاپەڕە (٢٠٣).نوسینی(سعد یوسف ابو عزیز).

**حەڤدەهەم:** ڕۆژێکیان ئیمامی (جعفەری صادق) داوای کرد لە خزمەت کارەکەی کە ئاوی بۆ بهێنێ بەدەستی دا بکات لەسەر تەشتێك،کاتێ خزمەت کارەکەی ئاوی هێنا ویستی بەدەستی دابکات یەکسەر ڕژایە سەر جلەکانی،ئیمامی جعفەر بەتوڕەییەوە سەیریرێکی کرد، خزمەتکارەکەی گوتی: گەورەم (وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ) واتە:ئەوانەی توڕەیی لەدڵیان دەخۆنەوە و زاڵ دەبن بەسەر نەفسیان ئیمامی جعفر گوتی: ئەوە توڕەییەکەم خواردەوە، خزمەتکارەکەی گوتی: (وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ) واتە: ئەوانەی لە خەڵکی دەبوورن و عەفویان دەکەن، ئیمامی جعفر گوتی: ئەوە عەفوم کردیت، خزمەتکارەکەی گوتی: (وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) واتە: خودای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە چاکەکاربن، ئیمامی جعفر گوتی: برۆ ئازادبە لە پێناو خودا بەڕەڵام کردیت، وەلەماڵی منیش هەزاردینار بۆ خۆت بەرە.بەمە دەڵێن لوتکەی تێگەیشتووی لە خودی خۆت ،کە لەو ئاستەوە بێتە ئەو ئاستە موتواضعة....[1]

**لەکۆتاییدا** داوا لەخودای باڵادەست دەکەین بەلوتفو کەرەمی خۆی لەمن و لە هەموو ئەو کەسانە خۆش بیت کە مەیلی بەهەشتیان هەیە و تۆزقاڵێك ترسی پەروەردگاریان لەدڵدا هەڵگرتووە و لەژیاندا هەوڵ بۆ ڕەزامەندی خودای پەروەردگار دەدەن وە خۆیان بەدوور دەگرن لە فیتنە و ئاشوبی سەردەم و بەئیرادەوە کارەکانیان دەکەن و ئیخلاصیەتیان کردووە بە پێشڕەوی خۆیان بۆ ئەوەی لە لای خودای خۆیان ئەجروپاداشتی نەبڕاوە مسۆگەر بکەن،هیچ کەسێك ناتوانێت هەڵەنەکات بەڵام هەموو کەسێك دەتوانێت

١ – کتێبی (بحر الدموع)، نوسینی امام (ابن الجوزی) لاپەڕە (٢٠٢).

تەوبە بکات و نەفسی دووبارە نویٚ بکاتەوە بە کردەوە چاك و پاکەکانی ،مرۆڤ بە پێی پلەی ئیمانی لە ژیانی دا تاقی دەکرێتەوە براوە ئەو کەسەیە کە ئامادەکاری تەواوی تێدایە بۆ ڕوودانی هەرشتێکی نەخوازراو کە سەرئێشەی بەدواوەیە و بەسەرکەوتوویی دەردەچێت، دڵ خۆشیش ئەو کەسەیە کە لەوتەمەنە کورتەی لەبەردەستی دایە بەجوانترین شێوە لێی بەهرەمەند دەبێت و بەرهەمێکی باش پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات بەشێوەیەك لەدوای خۆشی خەڵکی سودمەند دەبن و کاری پیٚ دەکەن، بۆیە منیش وەکو تاکێکی بە ئاگا ئەم بەرهەمە بچوکەی خۆم پێشکەش بە ئێوەی ئازیز دەکەم ، هەروەکو چۆن دڵنیام بابەتێکی بەسودە ئاواش دڵنیام کە بەدوور نیە لەکەم و کوڕی و نەقوستانی ،لەبەر ئەوەی سروشتی بەشەریەت وایە کارەکانی لەئاستێك دایە هەرگیس ناتوانرێت پلەی نایابی پیٚ بدرێت ،پلەی نایاب تەنیا شایەنی پەروەردگارە ، تەنیا ئەوە کە تەواوەو کتێبەکەی بەدوورە لە نەقوستانی، وە لەکەم و کوڕەیەکانمان ببورن ،ئەوەی زۆر هەوڵ دەدات و هەڵەدەکات زۆر باشترە لەو کەسەی کە هەڵەیەکی کردوو هەوڵی ڕاست کردنەوەی نەدات و بەردەوام بێت لەسەری ، مرۆڤی سەرکەوتوو بۆ گەیشتن بە هیواکانی زۆر دەکەوێت بەڵام لەشوێنی جیاواز نەوەکو لە یەك شوێن بەردەوام و دووبارە بکەوێت بەڵکو ناوەستێت و پاش هەر کەوتنێك کۆمەڵیٚ ئەزموون بۆ خۆی دەستەبەردەکات،بۆیە ئامۆژگاری بۆ خۆم و بۆ ئێوە ئەوەیە با تا دواهەمین هەناسەی ژیانمان نەوەستین و هەر لە هەوڵی بەدی هێنانی هەوڵ و ئامانجەکانمان بین وە تا بۆمان دەکرێت هاوکاری کەسانی تریش بین تا بەهۆی خۆمانەوە چەندین کەسی تریش بگەیەنین بەو هیوایانەی کە هەیانە ، وە بەزۆر خۆمان نەخەینە ژیانی هیچ کەسێکەوە تا دەست

له کارەکانی وەر بدەین بەبێ داواکاری ئەو، ئەمە لوتکەی ڕەوەشتە کە خەڵکانێکی زۆر حەز دەکەن پێی بگەن بەڵام کاتیان نیە و گرینگی پێ نادەن ، تالەتوانامان دا هەیە با خۆشەویستی ببەخشین بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە دەورروو بەرمانن ،چونکە وتراوە

**وابــــژی لــــەدونیا گــەر بمری**

**هەرچی ناوت بزانێ بۆت بگری.**

**ربنا آتنا في الدونيا حسنة وفي الأخرة حسنة وقنا عذاب النار وصلى الله على نبينا محمد وعلى آلـه وأصـحابه الأخيار وسلم تسليماً كثيراً........**

## سەرچاوەكان:


١ - قورئانی پیرۆز.

٢ - تەفسیری ڕامان نوسینی موفەسیری كورد (شێخ كاكە ئەحمەد مەحمود).

٣- تەفسیری (ابن الكثير).

٤- صحيح البخاری.

٥- صحيح مسلم.

٦- مسند امام احمد.

٧- سنني ابي داود.

٨- سنني الترمذي.

٩- صحيح ابن ابي دونيا.

١٠- صحيح وصايا الرسول،المجموعة الثانية ، مؤلف(سعد يوسف ابو عزيز).

١١- صفة الصفوفه مؤلف (إبن الجوزي).

١٢- (مرشد الخطيب) المؤلف(عبدالرحمان المصطاوي).

١٣- كتێبی (بەسەرهاتوو پەند وەرگرتن) نوسینی (هارون نوح طه).

١٤- الجامع صغير.

١٥- رسائل النور، بديع الزمان (سعد النورسي).

١٦- أحياء علوم الدين، المؤلف(ابن الجوزي).
١٧- موسوعة الأخلاق الأسلامية،المؤلف (سعيد يوسف محمد ابو عزيز).

١٨- (رياض الصالحين)،المؤلف (يحيي بن شرف النووي الشافعي).

١٩- (الفوائد) ،المؤلف(إبن القيم الجوزي).

٢٠- الموطأ وأصحاب السنن.

٢١- صحيح الشيخ البالأني.

٢٢- (روح البيان)،المؤلف (إسماعيل حقي مصطفى الإستانبولي الحنفي الخلوتي).

٢٣- (الجعفريات ) مستدرك الوسائل ،المؤلف(محمد بن محمد اشعث).

٢٤- كتيبى(دعائم الإسلام)بەشى١،مستدرك الوسائل ،المؤلف (القاضي أبو حنيفة النعمان بن محمد المغربي).

٢٥- (مكارم الأخلاق )، مستدرك الوسائل، بەرگى ٢،المؤلف( العلامة الحسن بن الفضل الطبرسي).

٢٦- بحر الدموع،المؤلف (ابن الجوزي).
٢٧- تەفسیری مونیر نوسینی (د.وهبت زوحەیلي).
٢٨- (الجواهر عن اقتراف الكبائر)،المؤلف(ابن حجر الهيتمي).

## با لەیادمان نەچێت

# ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾

( هەر بەیادی خودا دڵەكان ئارام دەبن )


خوایە ئەم دڵەم هێزێکـــی بەرێ
کە خەم لەناو خۆی بخاتە دەرێ
من خۆم نازانم چی بۆمن چاکە
تۆبەمەیلـــی خۆت دڵـم ئاواکە
باواز لە خەم خواردن بێنین لەبەرئەوەی
خەم بە خواردنی کەم ناکات
چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر